غانـت الـنفسُ: نەفسەکەی پیس‌و بەدکار بوو.

غِينَ على الرجل: هەڵەو بێ ئاگایی دڵی پیاوەکەی داگرت.

غِينَ بفلان: فلانکەس لەهۆش خۆی چوو ٥ لەخۆ بۆوە.

غِينَ بفلان: قەرز سواری شانی فلانکەس بوو.

الغانَةُ: ئەڵقەی سەری ژنی کەمان.

الغَيْنُ: لۆغەتێکە لە (الغيم) واتە هەور ٥ درەختی چڕو پڕو تێك چڕژاو کەخۆی تێدا حەشار بدرێ.

الغَيْنَةُ: دارستانی کێو و کەژ کە چڕو پڕبێ‌و لەشوێنێ بێرون روابن ناویان لێ نزیك نەبێ.

الغَيهبُ: بڕوانە (غَهَبَ).

أغيا الرجلُ: پیاوەکە گەیشتە ئەو پەڕی ڕێزو شکۆمەندی ٥ دەشگوترێ: (أغيا الأمرَ، واغيا الفرس في سباقه) کارەکە گەیشتە ئۆپەلاك ٥ ئەسپەکە لە پێشبرکێدا گەیشتە ئەو پەڕی گورج‌و گۆڵی.

أغيا عليه السحابُ: هەور سێبەری لێ کرد.

غايا فلان فلاناً: لە نیازو مەبەستدا فلان هاوەڵی فلانی کرد.

غَيَّا الغايةَ: کۆتایی ماوەکەی دانا ٥ سینگی کۆتایی سنوری چەقاند.

غَيَّ الشَّيْئَ: کۆتایی بۆ شتەکە دانا.

تغايَوا: دەگوترێ: (تغايَوا عليه حتى قتلوه) گەلەکۆمەکییان لێ کرد تا کوشتیان‌و لەناویان برد.

الغايَةُ: کۆتایی‌و نیازو مەبەست ٥ دەگوترێ: (غايتك أن تفعل كذا) ئەو پەڕی دەسەلاتی تۆ ئەوەیە ئەوە بکەی.

غاية الأمر: مەبەستی ئیشەکە ٥ دەشگوترێ: (فلان بعيد الغاية) فلانکەس ڕا دروست‌و بیر پەسەندە.

الغَيَابَةُ: هەرشتێك سێبەر لە مرۆڤ بکاو لە پشت سەرییەوە بێ وەکوو هەورو تەم‌و غارو سەقفی خانوو شتی وا.

**الفاء**: فێ؛ پیتی بیستەمە لە پیتەکانی هیجـا ٥ شـوێنی لێ دەرهـاتنی دەنگەکـەی نێـوان لێـوی سـەرو کـەناری ددانـی پێـشەوە بەشـی سەرەومیە ٥ (فێ) پیتێکی موهمەلە واتـە: لـە حروفـی عامیلـە نیـە ٥ یەکێکە لە حەرفەکانی عەتف.

**الفالوذ**: بڕوانە مادەی (فَلَذَ).

**إفتَأتَ برأيه وبِأمرِه إفتِئاتاً**: سور بوو لەسـەر ڕای خـۆیو هـەر ڕای خـۆی پێ پەسەند بوو.

**إفتَـأتَ عليـه القـولَ**: قـسەی بـۆ هەڵبەسـتو بوختـانی بەدەمـەوە هەڵبەسـت ٥ جاری وادەبێ وشـەکە سـەنگو سـووکی تێـدا دەکـرێو دەگوترێ: (إفتَاتَ إفتياتاً).

**فَأدَهُ فأداً**: نەخۆشی توشی دڵی بوو.

**فُئِدَ**: دەڵی هەنگێورا.

**إفتَأدَ القومُ**: خەڵکەکە ئاگریان کردەوە بۆئەوەی شتی پێ ببرژێنن.

**إفتَأدَ اللحمَ والخبزَ**: گۆشتو نانەکەی برژاند.

**تَفَـأدَت النـارُ**: ئاگرەکـە هەڵـگیرساو بڵێسەی سەند.

**الفؤاد**: دڵ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿ما



كَذَبَ الفؤادُ مـارأى﴾ ٥ دەشگوترێ: (هو فارغ الفؤاد) دڵی خاڵیە لەخەم هیچ خەمو خەفەتێکی لە دڵدا نیە ٥ دڵ ئارامە.

**الفَئِيدُ**: هەر شتێـك لەسـەر ئاگر سور کرابێتـەوە یـان کرابـێ بـەنانو برژابێ ٥ ئاگر ٥ ترسنۆك.

**المِفـأدُ والمِفـأدَةُ**: ئامێرێـکە گۆشتی پێ دەبرژێندرێ ٥ کۆڵەوەژ؛ ئامێرێـکە ئاگری تەندوری پێ تێکەڵ دەدرێ.

**فَـأرَ فـلانٌ فَـأراً**: فلانکـەس کونـە مـشکی هەڵکەند.

**فَـأرَ الـشَّيْئَ**: شتەکەی ژێـر خـاك کـردو شاردیەوە.

**فَئِرَ المكانُ فَأراً**: شوێنەکە مشکی زۆر بوو.

**فَئِرَ الطعامُ**: خواردنەکە مشکی تێکەوت.

**الفأرُ**: مشكو جرج گەورەو بچوك.

**الفَأرَةُ**: بە تاقە مشکێك دەگوترێ، یان بۆ مشکی مێینە بەکاردێ.

**فار الظهر**: گۆشتی پشت.

**فَار المسك**: شوشەی میسك ٥ ئەو زەرفـەی میسکی تێ دەکرێ ٥ هەروا (فَـأر) ئـاوە بۆ ئامێرێك داری پێ دەقلیشێنرێ.

**الفُـؤارَةُ**: شەرابێـکە لـە شـیرەمەنیو خورمـا دروسـت دەکـرێو

دەكوڵێنـدرێو دەكرێتـە دەرمـان بـۆ ئافرەتی زەیستان.

المَفأرَةُ: شوێنێـك مشكی زۆر لێ بێ.

فَأسَ الخَشَبَةَ فَأساً: دارەكەی بەپاچ یان بە بیور دولەت كرد.

فَأسَ فلاناً: پاچی لە فلانكەس دا، بەپاچ لێی دا ٥ تەشوێی لێ دا.

الفَـــأسُ: ئامێرێـــكە كلكـی لوســی تێدەخرێ سەرەكەی ئاسنەو زەوی پێ هەڵدەكەندرێ.

فأس اللجام: ئەو ئاسنەیە دەكرێتە دەمی ئاژەڵەوە بۆئەوەی هیچی بۆ نەخورێ، یان بۆئەوەی سەر نەرم بێو ژێربار بكرێ وەكوو لغاوی ئەسپو بارگیر ٥ (فأس الفم) ناودەم ئەو لایەی ددانی تێدان ٥ (فأس الرأس) پاشە سەر كە دەڕوانێتە پشتە مل ٥ (ك: أفؤس وفؤوس).

فَأفَأ: لە قسەكردندا زۆر پیتی (فێ)ی دووبارە كردەوە ٥ (فهو فأفأ وفأفاءٌ).

فَأقَ فُواقاً: توشی نەخۆشی پرخە پرخ بوو.

فَئِـقَ فَأقـاً: شـوێنی بەیەك گەیشتنی فەقەرەی یەكەمی عەموودی فەقەرە بە ئێسقانی دواوەی ئازاری بوو.

الفَأقُ: نەخۆشییەكە تووشی فەقەرەی ئادەمیزاد دەبێ.

الفُؤاقُ: لوغەتێكە لە (الفُواقُ).

فأءَلَـهُ: یـاری فیئـالی لەگـەڵ كـرد ٥ (تۆزێكی تر مانای (فیئال)دێ).

فَألَهُ بالشيئ: وای لێ كرد گەش بین بێ بەشتەكە.

إفتَألَ بالشيئ: گەش بین بوو بەرامبەر بەشتەكە.

تفاءَلَ به: بەمانا (إفتألَ) دێ.

تَفأَلَ به: بۆ موتاوەعەی (فَألَهُ) دێ.

الفَـألُ: قـسەیە یـان كردەوەیـە هیـوای خۆشـی لێ دەكـرێ ٥ وادەبـێ سـەنگو سوكی لە وشەكەدا دەكرێو دەگوترێ: (الفالُ) وایش دەبێ وشەی (ألفَـال) بـۆ شـــتی خـــراپ بەكاردەهێنـــدرێ ٥ دەگـوترێ: (لا فـألَ علیـك) هـیچ ناخۆشیو زیانت توش نەبێ.

الفِئالُ: یارییەكی منداڵانە، تاقمێكیان شتێك لەژێر گڵدا دەشارنەوە، دوایی دەبنە دووبەش، بەشێكیان پرسیار لـە بەشـەكەی تریـان دەكـا ئـاخۆ شتەكە لای كامیانە.

المُفائِـلُ: یـاریزانی فیئـال كـەر؛ ئـەو كەسەی یاری فیئال دەكا.

فَـأَمَ مـن المـاء فَأمـاً: تێـری لەئاوەكـە خواردەوە تێراو بوو.

فَـأَمَ في المـاء: دەمـی لەئاوەكـە نـاو خواردیەوە.

**فَأَمَ الحيوان:** ئاژەڵەکە دەمی خۆی پڕ کرد لە لەوەڕو پوش‌و پەڵاش.

**أفأمَ السَّرجَ أو الدَّلوَ ونحوهما:** دۆڵچەکەی فراوان کرد ٥ یان زینەکەی گەورە کرد، لێی زیاد کرد.

**فأمَ الرَّحلَ:** لە کەژاوەکەی زیاد کرد ٥ (فأمَ السَّرجَ أو الدَّلوَ) بەمانا (أفأمَهُ) دێ.

**الفئامُ:** پارچە قوماشێکە، لبادێکە لەناو کەژاوەدا رادەخرێ ٥ هەروا ناوە بۆ کۆمەڵێک ئادەمیزاد ٥ (ك: فُؤُم).

**الفُؤمَةُ:** پارچە قوماش، پارچە لباد ٥ دەگوترێ: (قَطَّعُوها فُؤماً).

**فَأي رأسهُ فأواً وفأياً:** سەری قاش کرد.

**إنفَأى:** شەق بوو، قەوارەی تێکەوت.

**الفَأوُ:** قەڵشت‌و دەربەندی نێوان دوو کێو.

**الفِئَةُ:** تاقم‌و پێڕ ٥ (ك: فِئات وفِئون).

**فَتِئَ فَتئاً:** دەگوترێ: (ما فَتِئَ يفعل كذا) بەردەوام تا ئێستا ئەو ئیشە دەکاو خەریکی ئەو کارەیە.

**فَتَّهُ فَتّاً:** وردو هاڕی کرد ٥ دەگوترێ: (فَتَّ في عَضُدِهِ) هێزو توانای کەم کردەوە ٥ لاوازی کرد.

**فَتَّتَ الشَّيْءَ:** شتەکەی زۆر وردو هاڕکرد.

**تَفَتَّتَ الشَّيْءُ:** شتەکە وردوخاش بوو.

**الفُتاتُ من الشَّيْءِ:** وردەو خوردەی لەشت دەکەوێتە خوار.

**الفَتُّ:** درزی بەرد ٥ وردە نان کە لەگۆشتاو گوشرابێ ٥ تێگوشراو ٥ (ك: فتوت).

**الفَتيتُ:** تێگوشاو، تریت ٥ شتێک لە بەرزییەوە بەربێتەوەو وردوهاڕ ببێ.

**الفَتيتَةُ:** پارچەی شتە وردو هاڕبووەکە ٥ (ك: فتائت).

**فَتَحَ بين الخصمين:** بڕیارو دادوەری لەنێوان کێشەکارەکاندا ئەنجام دا.

**فَتَحَ عليه:** شارەزای کرد، ڕێی نیشان دا ٥ دەگوترێ:

**فَتَحَ على القارئ:** ئەوەی خوێنەرەکە لەبیری چوبوەوە ئەم پێی گوتەوە، بیری هێنایەوە ٥ ڕێگای خێرو خۆشی بۆ کردەوە ٥ (فَتَحَ المغلق) دەرگا داخراوەکەی کردەوە.

دەگوترێ: (فَتَحَ البابَ والصندوق والقفل).

**فَتَحَ الكتابَ:** کتێبە لێک نراوەکەی لێک کردەوە.

**فَتَحَ الطريقَ:** ڕێگاکەی کردەوەو ڕێگای دا ڕۆیشتنی پێدا بکرێ.

**فَتَحَ الجَلسَةَ:** لیژنە کۆبوەکە، ئەنجومەنەکە دەستی بەکارەکانی کرد.

فَتَحَ في الميزانية إعتماداً: بڕێكی پاره تەرخان كرد بۆ لێ خەرجكردن بۆ بڕی مەساریفی پێویستو گرنگ.

فَتَحَ لفلان قلبه: دڵی بۆ فلانكەس كردەوەو نهێنییەكانی بۆ باس كردن.

فَتَحَ البلَدَ: وڵاتەكەی كۆنترۆڵ كردو دەستی بەسەردا گرت.

فَتَحَ الله قلبه للأمر: خودا دڵی فلانی كردەوە بۆ كارەكە دڵی نورانی بوو بۆ جێبەجێكردنی ئیشەكە.

فاتحه في الأمر: دەربارەی كارەكە سەرەتا قسەی لەگەڵ كرد.

فاتحه: قەرزەكەی دایەوە.

فاتح فلاناً: مامەڵەی لەگەڵ فلان كردو هیچی نەدایە.

فَتَّحَ الأبواب: بەمانا (فَتَحَ) دێ ٥ دەرگاكانی كردنەوە ٥ زۆری دەرگا كردنەوە.

إفتَتَحَ البابَ ونحوه: دەرگاكەی كردەوە.

إفتَتَحَ العَمَلَ: دەستی بەكارەكە كرد ٥ دەگوترێ: (إفتَتَحَ دورة المجمع أو المجلس) دەورەی كۆڕ یان ئەنجومەن كۆبوەوەو دەستی بەكارەكانی خۆی كرد ٥ دەشگوترێ:

إفتَتَحَ الكلامَ بالبسملة: قسەو ناخاوتنەكەی بە (بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێ كرد.

إنفَتَحَ البابُ: دەرگاكە كرایەوە ٥ بۆ موتاوەعەی (فَتحَهُ).

إنفَتَحَ عن الشَّيْئ: شتەكە دەركەوتو ئاشكرا بوو، پەردەی لەسەر هەڵدرایەوە.

فاتحا كلاماً بينهما: بە سرتەوە لەناو خۆیان دا دووبەدوو قسەیان كرد.

تَفَتَّحَ: بۆ موتاوەعەی (فَتَّحَ) دێ.

تَفَتَّحَ الأكمامُ عن النَّورِ أو اللوزة عن القطن: غونچەكە كرایەوەو گوڵەكە دەركەوت ٥ یان پەمۆكە دەمی كردەوەو لۆكەكە دەركەوت.

تَفَتَّحَ في الكلام: درێژەی بە قسەكان دا ٥ زۆری شانازی كرد.

إستَفتَحَ البابَ: دەرگاكەی كردەوە ٥ هەوڵیدا بیكاتەوە، داوای كردنەوەی دەرگاكەی كرد.

إستَفتَحَ فلاناً: داوای یارمەتی لە فلان كرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاسْتَفْتَحُواْ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ﴾.

الفاتحة: سورەتی فاتیحە ٥ سەرەتای هەمووشتێكو پێشەتاو دەسەگوڵی ٥ (ك: فواتح).

الفِتاحُ: كۆتایی پێ هێنانی كێشەو نیزاع.

الفَتَاحَةُ: یارمەتیدان.

الفَتّاحُ: ناوێكە لە ناوە جوانەكانی

خودا ٥ هەروا ناوه بۆ باڵندەیەکی ڕەنگ ڕەش زۆر کلکی هەڵدەتەکێنێ ٥ پێی دەگوترێ: ڕەشیشە.

**الفَتّاحَـةُ:** کلیلی هەڵپچرینی قوتو زەرفی دروستکراو لەتەنەکەو شوشەو شتی وا.

**الفَتحُ:** جۆره بزوێنێکه دەکەوێته کۆتایی وشەو نازناوی بینایه، دڵێ: فیعلی ماضي مەبنییه لەسەر فەتحه ئەگەر.....

**الفُتُحُ:** شتی کراوه، دەم فراوان ٥ دەگوترێ: (باب فُتُحُ) دەرگایەکه هەمیشه کراوەیه ٥ (قارورة فتح) گۆزەیەکه زارکی فراوان و پانەو تۆپەوانەی نیه.

**الفَتحَةُ:** نیشانەی بزوێنی تایبەتییه ٥ لەبواری ئیعراب دا.

**الفُتحَةُ:** دەلاقەو پەنجەرەو کون و درز.

**المِفتاحُ:** کلیلی قفڵ کردنەوه ٥ (ك: مفاتیح).

**المِفتَحُ:** بەمانا (المِفتاح) دێ ٥ لولەی ناوکێش ٥ (ك: مفاتح).

**فتخَهُ فَتخاً:** نەرمی کردو چەماندیەوه ٥ دەگوترێ: (فَتَخَ أصابع رجله في جلوسه) پەنجەی قاچی بڵاو کردنەوەو بۆلای پێشەوه چەماندیەوه.

**فَتِخَ فَتخاً:** نەرم بوو چەمایەوه.

**فَتِخَت الکف والقدم:** بەره دەستی یان قاچی پان و درێژ بوون ٥ دەشگوترێ: (فُتِخَ الرجلُ) پیاوەکه بەره دەستی و قاچی درێژو پان بوون.

**فُتِخَت الرجلان:** ئێسقانی قاچەکانی درێژ بوون و گۆشتیان کەم بوو ٥ دەشگوترێ: (فهو أفتَخُ وهي فتخاء).

**أفتَخَ:** شل بوو، ماندو بوو، سەرسام بوو.

**فَتَّخَ اصابعه:** پەنجەکانی لێك بڵاو کردنەوەو چەماندنیەوه.

**تَفَتَّخَ:** ئەڵقەی لەپەنجه کرد.

**الفَتخُ:** دیوی ناوەوەی نێوان قوڵ و باسکه.

**الفَتخاءُ:** حوشترێکه گوانەکانی بۆلای گەدەی بەرز بووبێتەوه ٥ هەڵۆی باڵ نەرم ٥ کورسیه دارینەیەکه له شورکه درەختی نەرم دروست دەکرێ.

**الفَتخَةُ:** ئەڵقەیەکه له زێڕ یان له زیو نقێمی نەبێ وەکوو ئەنگوستیله لەپەنجەی پەنا پەنجه بچکۆله دەکرێ.

**فَتَرَ فتوراً:** دوای توڕه بوون ئارام بۆوه دوای ڕەقی و توندی نەرم بۆوه ٥ بێ

هێزو بێ حەواس بوو ٥ دەگوترێ: (فترت المفاصل ٥ وفتر الماءُ الساخن ٥ وفتر البرد ٥ وفتر الطرف) چاوی شكا نەیتوانی سەیر بكا (فتر عن عملە) كەمتەرخەمی لە نیشەكەیدا كرد ٥ (فَتَرَ الى الشَّئِ) بەشتەكە دڵنیا بوو ئارامی گرت.

لە حەدیسدا هاتووە: (من فَتَرَ الى سنتي فقد نجا) كەسێك خوو بەرێبازی منەوە بگرێ رزگاری دەبێ.

**فَتَرَ الشَّئَ**: شتەكەی بەقولانج مەزەندە كرد ٥ بە قولانج پێوای.

**أفتَرَ**: پێڵوی چاوی زەعیف بوونو چاوی بێهێز بوو.

**أفتر الداءُ ونحوه فلاناً**: دەرمانەكە فلانكەسی لاواز كرد.

**فَتَّرَ**: بەمانا (فَتَرَ) دێ.

**فَتَّرَ السحابُ**: هەورەكە مت بوو نرم بۆوە، ئامادەیە بۆ باران بارین.

**الفاتِرُ**: نەساردو نەگەرم ٥ دەگوترێ: (طَرفٌ فاتِرٌ) پێڵوی چاو كەمێك تەنكو بەرەو خواربێ، بەجۆرێك چاوەكە مەست بنوێنێ.

**الفَتَارَةُ**: سەرەتای سەرخۆش بوون.

**الفِتْرُ**: قولانج، نێوان سەری پەنجەی قامكە گەورەو قامكە شادە بەكراوەیی ٥ (ك: أفتار).

**الفُترُ**: سەلە: كە لە پرژی درەختی خورما یان لە شورگی درەختی بی دروست دەگرێ ٥ نانی لەسەر دادەنرێ یان برنجو شتی وای لەسەر دەشۆردرێتەوە.

**الفَتْرَةُ**: چاو نەرمیو چاو كراوەیی كە دەبێتە هۆی چاو مەستی ٥ ماوەی نێوان دوو كات یان زەمانی هاتنی دوو پێغەمبەر.

**فَتْرَةُ الحمیٰ**: ماوەی كشانەوەو سرینەوەی لەرزو تا: واتە: ماوەی نێوان دوو نۆبە تا ٥ (فَتْرَةُ الرخاء) فەترەی هەرزانی: كە پیشەسازی پێش دەكەوێو نرخ گران دەبێ.

**فَتَشَ عن الشَّئِ فَتشاً**: لە شتەكەی كۆڵیەوەو بە دوودا چوونی بۆ كرد ٥ دەشگوترێ: (فتش الشَّئِ).

**فَتَّشَ الشَّئَ وعنه**: لە شتەكەی كۆڵیەوەو بەدوادا چوونی بۆكرد.

**فَتَّشَ الأمورَ والأعمالَ**: ئیشو كارەكانی بەسەر كردنەوە بۆئەوەی بزانێ ئاخۆ تاچەند بەگوێرەی یاساو رێساكان كراون.

**الفَتّاشُ**: ئەو كەسەی زۆر لەشت بكۆڵێتەوەو وردبینی تێدا بكات.

**المُفَتِّشُ**: كارمەندێكە لێكۆڵینەوەو بەدوادا چوون بۆ كاروباری دەوڵەت

یان کارگەو فەرمانگەکان دەکا.

**فَتَقَ الشَّیْئَ فَتقاً:** شتەکەی هەڵدڕی، شەقی کرد، کونی کرد ٥ دەگوترێ: (فتق الثوبَ) قوماشەکەی دڕی (فتق المِسكَ) شتێکی تێکەڵی میسکەکە کرد بۆنەوەی بۆنەکەی بڵاو ببێتەوە ٥ (فَتَقَ القُطنَ) لۆکەکەی شی کردەوە بەشەی کرد ٥ (فتق الكلامَ) قسەو ئاخاوتنەکەی پشت راست کردەوەو فراوانتری کرد.

**فَتِقَ فَتَقاً:** جەستەی قەڵەو و فراوان بوو ٥ (فهو فَتِقٌ) ٥ توشی قوڕی بوو (فهو أفتق وهي فتقاء).

**أفتَقَ السحابُ:** هەورەکە نەماو ئاسمان ساف بوو.

**أفتقت الشمسُ:** خۆر کەوتە نێوان دوپەڵە هەورەوەو دەرکەوت.

**أفتَقَ فلانٌ:** فلانکەس کەوتە پارچە زەوییەك کە بارانی کەم لێ باری بو بێ ڕوەك و درەخت بوو دەوروبەری بارانی زۆر لێ باری بوو ٥ فلانکەس بەڵاو کارەساتو روداوی ناخۆش گەلەکۆمەکییان لێ کردو ژیانی ناخۆش بوو.

**فَتَّقَ:** بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فَتَقَ) دێ.

**إنفتق:** شەق بوو.

**تَفَتَّقَ:** شەق بوو، شەقار شەقار بوو.

**تَفَتَّقتِ الماشیةُ:** ئاژەڵەکە قەڵەو بوو، جەستەی گەشەی کرد.

**تَفَتَّقَ بالكلام:** زمانی پڕژاو کەوتە قسەکردن و ئاخاوتنەکەی درێژەی کێشا.

**الفِتاقُ:** ناوەڕۆکی لیفی سپی ٥ (اللیف الأبیض): روخساری جوانی پێ دەشوبهێندرێ لەپاکی و جوانی دا ٥ مادەی خومرە کە دەکرێتە هەویرەوە بۆنەوەی باش هەڵبێ و ناسکی بکاو فشی هەڵبێنێ ٥ خۆر کە هەور داپۆشیبی و لەناکاوێك بکەوێتە ئاقاری هەساوەوەو دەربکەوێ.

**الفَتقُ:** قەڵشت و قەوارە ٥ کێشەو نیزاعی نێوان کۆمەڵ و لێکترازانی مەبەست و رازیان ٥ شوێنێکی سوتەمەرۆ کە دەوروبەری بارانی لێ باریبێ، گازیوەی بەیان ٥ تەنگ و چەڵەمەی ژیان ٥ قوڕ بوون ٥ (ك: فُتوق).

**الفَتَقَةُ:** زەویەکە لە دەوروبەری باران بباری و لەخۆی نەبارێ.

**الفَتیقُ:** زمان رەوان و قسە زان ٥ بەیانی روناك.

**المَفتَقُ:** شوێنی قەڵشت و دڕاو.

**المُفتَقَةُ:** تێکەڵەیەکە لە کۆمەڵێك داو و دەرمان بەزەیت و هەنگوین تێکەڵ دەکرێن بۆ قەڵەو بوون دەخورێ.

**فَتَكَ فَتكاً:** بەبێ لێ ورد بوونەوە دەستی بەئیشەکە کردو بیری لەوە نەکردەوە ئاکامی چۆن دەبێ.

**فَتَكَ بە:** فرسەتی لێ هێناو تیرۆری کرد ٥ بەئاشکرا کوشتی.

**فَتَكَ فِي الخُبثِ:** لە خراپەکاریدا زێدە ڕۆیی کرد.

**فَتَكَ فِي سلوكە:** ڕەوشتی بەد بوو ٥ سەرگەرمی خراپە بوو.

**أفتَكَ بە:** بەمانا (فَتَكَ) دێ.

**فاتَكَ فلاناً:** بەسەر فلانکەسدا زاڵ بوو ٥ فلانی ڕام کرد.

**فاتَكَ الأمرَ:** بەگەرمیو بەحەماسەوە پڕی دایە کارەکەو دەستی پێ کرد.

**فَتَّكَ القطنَ:** پەمۆکەی شێ کردەوە بەشەی کرد.

**تَفَتَّكَ بأمرە:** خۆی ملی لەکاری خۆی ناو سەربەخۆ ئەو کارەی کرد.

**الفَتّاكُ:** نەخۆشی کوشندە، زەبری کوشندە.

**فَتَلَ الحَبلَ وغيرە فَتلاً:** حەبلەکەی وەنیو بای دا ٥ دەشگوترێ:

**فَتَلَ فلاناً عن رأيە:** فلانکەسی لە ڕای خۆی ژێوان کردەوە.

**فَتَلَ وجهَهُ:** ڕوی لێ وەرگێڕا.

**فَتِلَ فَتلاً:** ماسولکە بەهێز بوونو گرێ گرێ وەستان ٥ دەگوترێ:

**فَتِلَت ذراعُهُ:** ڕەگو دەمارەکانی توندو پتەو بوونو باسكو قۆلی گرێ گرێ وەستا ٥ (فهو أفتَل وهي فَتلاء).

**افتَلَ السَّلَمُ والسَّمُرُ:** درەختی (سەلەمو سەمور) توێکڵیان فڕێدا ٥ توێکڵی تەنکی خۆی فڕێدا.

**فَتَّلَ الشَّيْئَ:** شتەکەی بادا.

**إنفَتَلَ:** خوارو خێچ بوو هەڵوێزنرا ٥ ڕوی وەرگێڕا ٥ وازی هێنا ٥ پاشگەز بۆوە ٥ دەگوترێ: (إنفَتَلَ عن رأيە وعن حاجتە وإنفتلَ وجهە عنهم).

**تَفَتَّلَ:** بۆ موتاوەعەی (فَتَّلَهُ) دێ.

**الفَتلُ:** شتی تێك باهەڵدراو ٥ چرۆو غونچەی نەپشکۆتو.

**الفَتلَةُ:** توێکڵی غونچەی درەختی (سەلەمو سەمور) پێش ئەوەی بپشکوێ ٥ گەڵای نەپشکوتوی درەختی (طەرفاء و ئەسەل) کەهێشتا هەر لولەو پان نەبۆتەوە ٥ پارچە هەودای لۆکەو ئاوریشم ٥ توندو پتەوی ڕەگی دەستو بازو ٥ میوەی درەختی عورفوط ٥ پێمەڕەو خاکەناز.

**الفَتيلُ:** شتی نەکراوە ٥ ئەوەی مرۆڤ لە نێوان پەنجەکانی دەهاڵێنێ لە هەوداو کوڵك یان ئەو چڵكو شتەیە لەناو پەنجەکانی خڕی

هەڵدەداو گرمۆڵ گرمۆڵ دەوەستێ ٥ ئەو داوە دەزولەیە دەکەوێتە سەر قەڵشتی ناوکەخورما ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿بَلِ اللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَاء وَلاَ يُظْلَمُونَ فَتِيلاً﴾ ٥ خێتو داوێکی درێژە بەتەقەمەنییەوە دەبەسترێو ئاگری پێوە دەنرێ بۆئەوەی ئاگرەکە بەپەتەکەدا بڕوا تا دەگاتە سەر تەقەمەنیەکەو بتەقێتەوە.

**الفَتِيلَةُ**: پلیتەی چرا ٥ (ك: فتائل).

**فَتَنَ المَعدنَ فَتناً وفتوناً**: مادەی مەعدەنەکەی کردە ناو ئاگرەکەوە بۆئەوەی بەتاقی بکاتەوە ٥ دەگوترێ: (فَتَنَه النار) ئاگر سوری کردەوە ٥ (فَتَنَ فلاناً) فلانکەسی سزا دا بۆئەوەی لە هەڵسوکەوتو ڕای خۆی پەشیمان ببێتەوە ٥ دەشگوترێ: (فَتَنَه بە وفیه) حەزی لێ کرد عاشقی بوو ٥ (فَتَنَتْه المرأةُ) ئافرەتەکە شێتو شەیدای کرد.

**فَتَنَ فلاناً عن الشَّيْئ**: فلانکەسی لەشتەکە لادا پاشگەزی کردەوە ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ﴾.

**فَتَّنَهُ**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فَتَنَهُ) دێ.

**إفتَتَنَ بالأمر**: شەیدای کارەکە بوو پێی موعجەب بوو.

**إفتَتَنَ بالمرأة**: شەیداو عاشقی ئافرەتەکە بوو.

**إفتَتَنَ فلاناً**: فلانکەسی خستە ناو فیتنەو ئاشوبەوە.

**تفاتن رجال**: پیاوەکان شەڕیان بوو کەوتنە نێوان شەڕو ئاشوبەوە.

**الفَتَّانُ**: شەیتان ٥ دزو خائین کە دێتە سەر ڕێگای کاروان بۆئەوەی ڕوتیان بکاتەوە ٥ ئاڵتونچی لەم ڕووەوە کە ئاڵتونو زیو لە بۆتە دەداو بەتاقیان دەکاتەوە.

**الفتّان**: زێڕو زیو (دینارو دیرهەم).

**فَتّانا القبر**: دوو فریشتەی مونکەرو نەکیر

**الفِتنـة**: بەتاقی کردنەوە بەئاگر، لە بۆتەدان ٥ سزادانو ئاڵو گۆڕکردن لە تاقی کردنەوەدا ٥ سەرسوڕمان بەشتو سوکایەتی پێکردنی ٥ گومڕاییو ڕی لێ تێکچون ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدِ اللَّهُ فِتْنَتَهُ فَلَن تَمْلِكَ لَهُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾.

**فِتنة الصدر**: دەغدەغەو وەسوەسەی ناو دڵە.

**الفُتنةُ**: جۆرێکە لە درەختی (السَّنط) گوڵەکەی زەردو بۆنخۆشە.

**الفَـتِينُ**: زەوی ڕەشە خاك بەردەکانی دەڵێی سوتاون.

**المفتون**: شێت ٥ هەروا بەمانا (الفِتنـة)

دێ ◦ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿بِـأَيِّكُمُ الْمَفْتُونُ﴾.

فتاه فَتـواً: لـە ئازايـەتیو مەردایەتیدا بەسەری دا بالاّدەست بوو.

فَتُوَ فَتَاءً وفُتُواً وفُتُوّةً: بوو بەگەنج.

فَتِيَ فَتىً وفِتاءً: بەمانا (فَتُوَ) دێ.

أفتى في المسألة: دەربارەی مەسـەلەکە حوکمی شەرعی رون کردەوە.

فَاتَــاهُ: لـە پیـاوەتیو مـەردایتی دا بەسـەریا بالاّدەسـت بـوو ◦ دادگـایی کرد.

فُتِيَّتِ البنت: منداڵە مێینەکە بڕیاری ئەوەی بۆ درا کە لەتەمەنی منداڵی تێپەڕیو بوو بە کچی گەنج.

تفاتى المرأ: پیاوەکـە ڕێبازی پیاوەتی گرتەبەر.

تفاتى القوم الى الفتى: خەڵکەکە چون بـــۆلای مــــوفتیو رابەرەکـــــەیان بۆئـــەوەی فتوایـــان بـــۆ بـــداو کێشەکەیان یەکالاّ بکاتەوە.

تَفَتَّى: بوو بەگـەنج ◦ ڕێبـازی پیاوەتی گرتەبەر.

تَفَتَّتِ البنتُ: منداڵە مێینەکە بـوو بە گـەورە کـچ، لەتەمــەنی منــداڵی تێپەڕی.

تتفتـتِ الـصغيرة: منداڵـە مێینەکـە: هەڵسو کەوتی گەورە کچی پـەیڕەو کرد.

إستَفتاه: داوای راو بۆچـونی لێ کـرد ◦ ویـستی فتـوای بۆبـدا لــە بــارەی مەسەلەکەوە.

الفَتَــى: گــەنج ◦ ســەرەتای گــەنجی، تەمەنی نێوان موراهەقەو پیاوەتی ◦ دەســــتو دڵ کــــراوەو ســــەخی سروشــــت ◦ بــــەهانا هــــاتووی لێقـەوماوان ◦ خزمـەتکار ◦ قورئـان دەفەرموێ: ﴿قَالَ لِفَتَاهُ آتِنَا غَدَاءنَا﴾.

الفُتُــــوّةُ: تەمــــەنی گــــەنجی نێــــوان موراهەقەو پیاوەتی ◦ ئامادەباش بۆ بــەهاناوە چـوونی لێقـــەوماوان ◦ مەدرەسەو ڕێساو یاسایەکە ڕەوشتی پیــاوەتیو ئازایــەتی لــە مرۆڤـــدا پەروەردە دەکا.

الفَتوى: وەلاّمـی شـەرعی یـان قـانوونی دەربـارەی مەسـەلەو تەنگەژەیـەك ◦ (ك: فتــاوِ، فتــاوى) (دار الفتــوى) شوێنی فتوادان.

الفُتيا: بەمانا (الفتوى) دێ.

الفَتـــىُ: گـــەنج ئـــادەمی بـــێ یـــان گیانلەبەری تر ◦ (ك: فِتاء وأفتاء).

المفتي: کەسێـك خۆی تەرخان بکـا یـان بەفـەرمی ئـەرکی فتـوادانی بخرێتـە ئەســـتۆ، مەســـەلە شـــەرعیو قانونیــــەکان بــــۆ خەڵـــکی رون بکاتەوە.

**فَثَـأ اللـبنُ فَثْـأً**: شیرەکە کوڵی ٥ گۆڕاو بزرکـا ٥ گەرماییەکـەی شـکایەوە. ساردبۆوە.

**فَثَأ القِدرَ**: کوڵانی مەنجەڵەکەی شکاندەوە بـەئاوی سـارد یـان بـەهۆی سـارد کردنەوەی بەشتی تر.

**فَثَأ غَضَبَهُ**: ڕقەکەی نیشتەوە توندو تیژی پێوە دیارنەما.

**فَثَأ البارِدَ**: ساردی شتەکەی بەگەرمکردن شکاند.

**فَثَـأ فلانـاً عـن رأيـه**: فلانکەسی لـە ڕاو بۆچوونەکەی لادا ژێوانی کردەوە.

**فَثِئَ الرجلُ فَثْأً**: پیاوەکە ڕقی نیشتەوە. دەگوترێ:

**فَثِئَ الغضَبُ فُثُوءاً**: ڕقەکەی نیشتەوە.

**أفثَأ الحَرُّ**: گەرما دامرکایەوە، ڕەوییەوە.

**أفثَـأ الرجـلُ**: پیاوەکـە مانـدوو بـوو، وەرزو جاڕس بوو.

**أفثأت السماءُ**: ئاسمان ساو بوو.

**أفثأ بالمكان**: لە شوێنەکە مایەوە.

**أفثأ القومُ للمريض**: خەڵکەکە بەردیان گـەرم کـردو ئاویـان لێ پڕژانـد خستیانە سەری بۆنەوەی ئارەق بکا.

**فَـثَّ الحـارَّ بالبـارد**: بەسـاردییەکە گەرمییەکـەی شـکاندەوە ٥ دایمرکاندەوە.

**فَـثَّ وعـاءَ التمـر**: سـەبەتە خورماکـەی کردەوە[illegible]

**إنفَثَّهُ**: ژێرباری کرد، ملکەچی کرد.

**إنفَثَّ**: بۆ موتاوەعەی (فَثَّه) دێ.

**فَثَجَ الشَّيْءَ فَثْجاً**: شتەکەی کەم کردەوە.

**فَثَجَ البِئرَ**: بیرەکەی دەردا ٥ دەشگوترێ: (فلان بحر لا يفثَجُ) فلانکەس دەریایەو زانیاری لێ نابڕێ.

**فَثَجَ الحارَّ بالبـارد**: بەساردییەکە هـەڵاوی گەرمییەکەی شکاندەوە.

**أفـثَجَ الرجـلُ**: پیاوەکـە مانـدوبوو هەناسەی لێ بڕا.

**فَثَّـدَ درعـه**: زرییەکـەی بـە ئاوریـشم ئاواخن کرد.

**الفَثائِدُ**: ئاواخنی پۆشاک و شتی تـر ٥ هەوری گەواڵ گـەواڵ و چین لەسـەر چین.

**الفـاثورُ**: یاساوڵ و جاسوس ٥ تەشت و سوێنە.

**فَثَغَ رأسهُ فَثْغاً**: سەری شکاند.

**فَجأه الأمرُ فَجئاً وفجأةً وفُجاءةً**: کارەکـە لەناکاو یەخەی گرت.

**فاجَأه مفاجـأةً**: لـەناکاو یەخـەی گـرت و پەلاماری دا.

**الفَجأةُ**: هەرشتێـک لەناکاو توشی مرۆڤ بێ ٥ (موت الفَجأة) مردنـی لـەناکاو، مەرگی موفاجات.

**فَجَّ فَجّاً**: نێوان قاچی پانکردن.

**فَجَّ الأرضَ**: کەندرێ قوڵی لە زەوییەکە کرد.

**فَجَّ الرجلُ والدابةُ فَجاً وفجيجاً:** پیاوەکە پان ولاخەکە نێوان قاچی پان کردەوە، قاچی پان کردنەوە.

**فَجَّ القوسُ:** ژێی کەوانەکە لە پشتی کەوانەکە دوورکەوتەوە.

**أفَجَّ:** بە چۆلەوانیو کونو کەلەبەردا ڕۆیی‌و سەری خۆی هەڵگرت ٥ پەلەی کردو خێرا ڕۆیی ٥ نێوان قاچەکانی پان کرد.

**أفَجَّ الأرضَ بالمحراث:** بەهەوجارو گاسن زەوییەکەی دڕی.

**فاجَّ مفاجّةً وفجاجاً:** نێوان قاچەکانی پان کرد ٥ دەگوترێ: (فاجَّ رجليه ومابين رجليه) نێوان قاچەکانی پان کردن.

**إفتجَّ:** بە چۆلەوانی‌و کونو کەلەبەرو سارای کاکی بەکاکی دا ڕۆیی ٥ ڕێگای دووری بڕی.

**إنفجَّت القوس:** ژێی کەوانەکە لە پشتی کەوانەکە دوور کەوتەوە.

**تفاجَّ:** زێدەڕەوی کرد لە بلاوکردنەوەی قاچەکانی ٥ دەشگوترێ: (تفاجَّت الناقة للحَلَب).

**الأفجيج:** دۆڵو شیوی فراوان.

**الفُجاجُ:** ڕێگەی پانو پۆڕ.

**الفَجاجةُ:** (فجاجة كل شيء) کاڵو نەگەییو نەکولاو ٥ میوەی نەگەییو.

**الفَجُّ:** ڕێگای پانو پۆڕو دوورو درێژ ٥ (ك: فِجاج وأفجة).

**الفِجُّ:** کاڵو دەربەند ڕێگای تەنگەبەر.

**فَجَرَ أمرُ القوم:** کاری خەڵکەکە گەندەڵ بوو، گەندەڵی تێکەوت.

**فَجَرَ في يمينه:** لە سوێندەکەیدا درۆی کرد.

**فَجَرَ الراكب عن سرجه:** سوارەکە لەسەر زینەکە خوار بوو، لار بوو.

**فَجَرَ عن الحق:** لەحەق‌و ڕاستی لایدا.

**فَجَرَ من مرضه:** لە نەخۆشییەکە چاك بۆوە.

**فَجَرَ القناة:** جۆگەکەی شەق کرد، جۆگەی ڕاکێشا ٥ دەشگوترێ:

**فَجَرَ الماءَ:** ڕێگای بۆ ئاوەکە کردەوە.

**فَجَرَ الله الفَجرَ:** خودا بەیانی دەرخست، کازیوەی بەیانی ئاشکرا کرد.

**أفجَرَ:** کەوتە ناو کازیوەی بەیانییەوە ٥ تاوانی کرد ٥ لەحەق‌و ڕاستی لای دا.

**أفجَرَ فلاناً:** فلانکەسی بەگوناهبار هاتە بەرچاو.

**أفجَرَ الينبوعَ:** ڕێگای بۆئاوی کارێزو سەرچاوەکە کردەوە.

**فاجَرَ مفاجَرةً وفِجاراً:** هاوبەشی کرد لە ئەنجامدانی تاوان دا.

**فَجَّرَ:** بۆ زێدەڕەوی لەمانای (فَجَرَ) دێ ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا﴾.

فَجَّـرَ الرجـلُ القذيفـة ونحوهـا: پياوەكـە تۆپەكەی تەقاند.

فَجَّرَ فُلاناً: تاوانو خراپەكاری پاڵ فلان دا ٥

إفتَجَـرَ الكـلامَ: لـە خۆيـەوە قسەكانی هەڵبەسـتو لەكەسـی نەبيـستبوو كەسـيش ئـەو قـسانەی پـێ ڕانەگەياندبوو.

إنفَجَرَ: بۆ موتاوەعەی (فَجَرَ) دێ.

إنفَجَـرَ المـاءُ ونحـوه: ئاوەكـە هـەڵقوڵا، نەوتەكە هەڵقوڵی.

إنفَجَرَ فلانٌ باكيـاً: فلانكەس لـە قلّپـی گريانی دا.

إنفَجَـرَ الـصُبحُ: شـەو ڕابـوردو نـەما، تاريكی ڕەوييەوە.

إنفَجَـرَ علـيهم العـدوُّ: لـەناكاو دوژمـن پــەلاماری دانو بەسـوپای زۆرەوە هێرشيان كردنە سەر ٥ دەشگوترێ: (إنفَجَـرَت علـيهم الـدواهي) بـەلاو كارەسات داباريە سەريانو لەهـەموو لايەكەوە تەنگی پێ هەڵچنين.

تَفَجَّرَ: بۆ موتاوەعەی (فَجَّرَ) دێ.

تَفَجَّرَ الماءُ ونحوه: بەمانا (إنفَجَرَ) دێ.

تَفَجَّرَ الصُبحُ: بەمانا (إنفَجَرَ) دێ.

الفـاجِرُ: گوناهكـارو بــەد ڕەوشــت بەجۆرێـــك گــوێ بــەهيچ ياسـاو ڕێسايەك نـەدا ٥ دەشـگوترێ: (يمـين فـاجرة) سوێندی بـەدرۆ (ك: فجـار وفَجَـــرَة) ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿أُولَٰئِكَ هُمُ الْكَفَرَةُ الْفَجَرَةُ﴾.

فَجَارِ: بـەو شێوە بينايـە دێو نـاوە بـۆ گونـاهو تـاوانو دەشـكرێتە ئاوەڵنـاو بـۆ ئـافرەتو نيـدای لێ دەكـرێ ٥ دەگوترێ: (يا فَجَارِ).

الفِجـارُ: شـەڕی فيجـار؛ شەڕێـكە لـە نێوان قورەيشو هاوسوێندەكانيانو لـەنێوان هـۆزی هەوازينـدا ڕوی دا، پێغەمبــەر (د.خ) كــە ئــەو كاتــە تەمەنی بيست ساڵ بـوو هاوبەشی ئەو شەڕەی كرد.

الفَجر: كـازيوەو ڕونـاكی بـەيانی ٥ ئـەو كــازيوەو ڕوناكييـــە دوو جـــۆرن فەجری كازيبو فەجری صاديق.

فُجَــرُ: بـۆ زێـدەڕۆيی لـەمانای (فـاجر) دا بەكار دەهێنـدرێ ٥ تەنها لـەكاتی بـانگ كردندا بەكاردەهێندرێ.

فَجرَةُ: دەگـوترێ: (رَكِـبَ فـلانٌ فَجـرَةُ) فلانكەس درۆيەكی گەورەی كرد.

الفَجــرَةُ: شــوێنی ئـاو لێ هــەڵقولان ٥ (فُجرَةَ الوادي) دەراوی شيو و دۆڵ.

المتفجـــرات: تەقەمـــەنی؛ مـــەوادی كيمياوييــە، قومبولـــەو مينـــی لێ دروســـت دەكـــرێو ئامـــادە باشـــی تەقينەوەی تێدايە.

**فَجَسَ فَجساً**: خۆی بەزلزانیو لوتبەرزیی نواندو تاوانی کرد.
**تَفَجَّسَ**: بەمانا (فَجَسَ) دێ.
**فَجَعَهُ فَجعاً**: ئازاری زۆری پێ گەیاند ٥ دەگوترێ: (أمر فاجع) رووداوێکی ناخۆشو جەرگبڕە ٥ بەڵایەکی گەورەو ترسناکە.
**فَجَّعَه**: زۆر ئازاری دا.
**تَفَجَّعَ**: بەهۆی بەڵاو کارەساتەکەوە ئازاری پێ گەیی ٥ دەشگوترێ: (تَفَجَّعَ لفلان) زۆر خەفەتبارو نارەحەت بوو بۆ فلان.
**الفاجِعُ**: قەلەڕەشی شومو نەگبەتی ٥ دەگوترێ: (رجل فاجع) پیاوێکی دڵ بەئازارو خەفەتبارە ٥ (إمرأة فاجعة) ئافرەتێکی کۆست کەوتووە، کارەساتی گەورەو جەرگبڕی لێ رودراوە.
**الفاجِعَة**: بەڵاو کارەساتێک زۆر جەرگبڕ بێو ئازار بەمرۆڤ بگەیەنێ ٥ جا کارەساتەکە لە دەستدانی خۆشەویست بێ یان ماڵو سامان بێ ٥ (ك: فواجع).
**الفَجوع**: بەمانا (الفاجع) دێ ٥ دەگوترێ: (موت فاجع) ٥ مردنێکی جەرگبڕە.
**الفَجيعَة**: بەمانا (الفاجعة) دێ ٥ (ك: فجائع).
**المفجَعُ**: بەمانا (الفاجع) دێ ٥ دەگوترێ: (میت فاجع ومُفْجَعٌ).
**فَجفَجَ**: شانازی کرد بەشتێک کەنیەتی، لافو گەزافی شتێکی لێ دا: کەهی ئەو نەبوو ٥ (فهو فجفاج وفجافج).
**فَجِلَ الشَّيْئُ فَجَلاً**: شتەکە شلو گەورە بوو داچۆڕا.
**فَجَّلَ الشَّيْئَ**: شتەکەی پان کرد.
**إنتَجَلَ أمراً**: کارەکەی دروست کرد، دایهێنا.
**الأفجَلُ**: گەڵ پان، کەسێک نێوان دوقاچی پان بێ.
**الفَجّالُ**: تور فرۆش.
**الفُجلُ**: تور.
**فَجِمَ فَجماً**: شەویلەی گەورە بوو (فهو أفجم وهي فَجماءُ).
**إنفَجَمَ الوادي**: شیوەکە، دۆڵەکە پانو فراوان بوو.
**تَفَجَّمَ الوادي**: بەمانا (إنفَجَمَ) دێ.
**الفُجمَةُ (فجمَةُ الوادي)**: دەراوی شیو و دۆڵ.
**فَجَا البابَ فَجواً**: دەرگاکەی کردەوە.
**فجا القوسَ**: نێوان ژێو و پشت کەوانەکەی پان کرد.
**فَجِيَ فجاً**: نێوان دوو ئەژنۆی فراوان کرد ٥ (فهو افجى وهي فجواء).

أَفجَى الرجلُ: پیاوەکە بژێوی ماڵو منداڵی خۆی زیاد کرد.
فَجّاهُ: دەری خست.
فَجّاهُ عنه: دوری خستەوە ٥ پاڵی پێوەنا.
تفاجى: کەلێنی تێکەوت.
الفَجوَةُ: کەلەبەری نێوان دوشت ٥ (فجوة الدار) حەوشەی ماڵ ٥ بەردەرگای ماڵ.
الفَجواءُ: کەلەبەرو نێوان پانتایی نێوان دوشت.
فَحَثَ عنه فَحثاً: لێی کۆڵیەوە ٥ دەگوترێ: (فَحَثَ عن الخبر) (وفَحَثَ في الأرض).
إفتَحَثَ عنه: لێی کۆڵیەوەو توێژینەوەی تێدا کرد ٥ دەشگوترێ: (إفتَحَثَ ما عند فلان).
الفَحِثُ (فَحِثُ الكرشِ): شتێکی بۆش‌و قاتقاتە بەورگەوە پەیوەستە.
فَحِجَ فَحَجاً: پێشی قاچەکانی لێك نزیك بوونەوە دواوەی قاچەکانیشی لێك دوورکەوتونەوە ٥ (فهو أفحج وهي فَحجاء) ٥ (ك: فُحِجَ).
أفحَجَ عن الأمر: لەکارەکە هەڵسڵەمیەوەو پاشەو پاش کشایەوە.
أفحَجَ حلوبتَه: قاچی ئاژەڵە شیردەرەکەی لێك بڵاو کردن بۆ ئەوەی بتوانێ شیرەکەی بدۆشێ.
فَجَّحَ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فَحَجَ) دێ.
فَجَّحَ رجليه: نێوان قاچەکانی فراوان کرد قاچەکانی لێك دوور خستنەوە.
إفتَحَجَت ساقاه: قاچەکانی لێك بڵاو بوون.
فَحَّتِ الأفعى فَحّاً وفَحيحاً: مارەکە فیشکەی کرد.
فَخَّ النائِمُ: نوستوەکە پرخە پرخی کرد.
فَحُشَ القولُ والفعلُ فُحشاً: قسەو کردەوەکە زۆر ناشیرین بوو.
فَحُشَ الأمرُ: کارەکە لە سنوری خۆی دەرچوو ٥ (فاحِش، وفحّاش).
فَحُشَ فُحشاً وفحاشةً: بەمانا (فَحَشَ) دی ٥ دەشگوترێ: (فَحُشَ على من معه).
أفحَشَ: کاری خراپ‌و ئابڕو بەرەی هێنایە پێشەوە.
أفحَشَ عليه في المنطق: قسەی ناشیرین‌و بێ ئابڕوانەی لەگەڵ یدا کرد.
فَحُشَ بالشيءِ: عەیب‌و عاری لێ گرت.
تَفاحَشَ: تاوان‌و خراپەکاری بە ئاشکرا ئەنجام دا شەرمی نەکرد.
تفاحَشَ القومُ: خەڵکەکە بەئەنجامدانی فاحیشە یەکتریان تاوانبار کرد.
تفاحَشَ الأمرُ: کارەکە خراپیەکەی زۆر پەرەی سەند.

**تَفَحَّشَ**: بەمانا (تفاحش) دێ ٥ عەیبو عاری پاڵدا.

**الفاحِشَةُ**: مێینەی (الفاحِش)ە ٥ قسەو کردەوەی ناشیرینو خراپو نەشیاو ٥ (ك: فواحش).

**الفُحشُ**: ناشیرینو نەشیاو لە گفتارو کردار.

**فحصت القَطاةُ فحصاً**: قەتێیەکە لانەیەکی بۆخۆی دروست کرد هێلکەی تێدا بکا.

**فحص عن الأمر**: بە دوادا چوونی بۆ کارەکە کردو لێی کۆڵیەوە.

**فحص في الأرض**: زەویەکەی هەڵکۆڵی.

**فحص الشَّيْءَ**: کەشفی شتەکەی کرد.

**فحص الطبیبُ المریضَ**: پزیشکەکە نەخۆشەکەی پشکنی بۆئەوەی بزانێ نەخۆشییەکەی چیە.

**فحص الكتابَ ونحوه**: لە کتێبەکە ورد بۆوە تابزانێ چیەو باسی چی دەکا.

**إلتحص عنه**: بەمانا (فحص عنه) دێ.

**تَفَحَّصَ**: زێدە ڕەوی کرد لە پشکنیندا ٥ زۆری پشکنی.

**الأفحوص**: چاڵێکی بچکۆلەیە قەتێ یان مریشك هەڵی دەکەنێ بۆ ئەوەی هێلکەی تێدا بکاو لەسەریان کڕ بکەوێ ٥ (ك: أفاحیص).

**الفحصة**: چاڵایی چەناگە یان ڕومەت.

**المَفحَصُ**: بەمانا (الأفحوص) دێ ٥ (ك: مَفاحص).

**فَحفَحَ**: لەخەودا پرخە پرخی کرد ٥ گرییەك لەدەنگی دا پەیدا بوو ٥ قسەی زۆر کرد.

**فَحَلَ الإبلَ و نحوها فحلاً**: نێرە حوشتری کردە ناو ڕەوە حوشترەکانەوە بۆ کەڵدانیان ٥ دەشگوترێ: (فَحَلَها فحلاً).

**أفحَلَ فلان**: فلانکەس کەڵەحوشتری پەیدا کرد.

**أفحَلَ فلاناً فحلاً**: فلانکەس کەڵە حوشتری دا بەفلانکەس.

**إفتَحَلَ فلاناً بعیراً**: کەڵە حوشتری دا بەفلانکەس.

**تَفَحَّلَ**: خۆی شوبهاند بە کەڵەحوشتر.

**تَفَحَّلَ الشجرُ**: درەختەکە بێ بەر بوو بەری نەگرت.

**إستَفحَلَ الأمرُ**: ئیشەکە قورس بوو لەوزەی مرۆڤ دەرچوو.

**إستفحلت النخلةُ**: درەختە خورماکە نەزۆك بوو بەری نەگرت.

**الفحالَةُ**: نێرینەیی.

**الفُحّالُ**: درەختە خورمای نێر ٥ (ك: فحاحیل).

**الفَحلُ**: نێرەی بەهێزو توانا لەهەر زیندەوەرێك بێ.

**فحول الشعر وفحول العلم**: ئەو کەسانەن

که زۆر سەرکەوتوون لەو بوارانەدا.

**الفَحلَةُ من النساء**: ئافرەتی چەقەچەناو، زمان در یێژ.

**الفِحلَةُ**: بەمانا (الفِحالة) دێ.

**الفُحُلَةُ**: بەمانا (الفِحالة) دێ.

**الفَحيلُ**: کەڵی چاكو ڕەسەن کە بەئاشکرا کەڵیەتەکەی پێوە دیار بێ.

**فَحَمَ الصَّبِيُّ فَحماً وفحوماً**: منداڵەکە بەهۆی زۆر گریانەوە هەناسەی لێ بڕا، دەنگی نووسا.

**فَحَمَ فلان**: فلان بێ دەنگ بوو، بۆڕی خواردو نەیتوانی وەڵام بداتەوە.

**فَحُمَ الشَّيْئُ فحوماً وفحومةً**: شتەکە ڕەش بوو ڕەش هەڵگەڕا.

**أفحَمَ القوم**: خەڵکەکە کەوتنە ناو تاریکی کاتی خەوتنەوە لەشەودا.

**أفحَمَ البكاءُ الصَّبِيَ**: گریان هەناسەی لە منداڵەکە بڕیو دەنگی نووسا.

**أفحَمَ الخصمَ**: کابرای ڕکابەری بێدەنگ کرد بۆڕی دا.

**أفحَمَ الهمُّ ونحوه فلاناً**: خەمو خەفەت نیشاتو وزەی لە فلان بڕی.

**فَحَّمَ الخشبَ**: دارەکەی کردە خەڵوز.

**فَحَّمَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بە خەڵوز ڕەش کرد.

**الفاحِمُ**: شتی زۆر ڕەش ٥ دەگوترێ: (أسود فاحِم).

**الفِحامَةُ**: پیشەی خەڵوز چیەتی ٥ ڕەژوکاریی.

**الفَحّامُ**: خەڵوز فرۆش ٥ کەسێك خەریکی خەڵوز بێ.

**الفَحمُ والفَحَمُ**: خەڵوز.

**الفحم النباتي**: ئەو پاشەڕۆکەی دوای سوتانی پوشو پەڵاش دەمێنێتەوە.

**الفَحم الحجري**: مەعدەنێکی ڕەشو بریسکەدارە یان مەیلەو ڕەشە لە مادە نەباتییەکانی ناو سکی زەویو تێپەڕ بوونی ساڵەهای ساڵو ملیۆنە ساڵ بەسەری دا پێك هاتووە.

**الفَحمَةُ**: (فَحمَةُ الليل) ڕەشایی شەو تاریکی ٥ یان زۆر ڕەش.

**الفحيمُ**: شتی زۆر ڕەش.

**المُفحَمُ**: دەسەوەسانو بۆڕ خواردو لەبەرامبەر بەڵگەی بەرامبەر ٥ زمان گیرانو قسە پێ نەمان.

**المَفحَمَةُ**: دەفەرو وڵاتێك خەڵوزی بەردینی لێ بێ.

**فَحا بكلامه الى كذا فحواً**: قسەکەی ئاڕاستەی فلان شت کرد.

**فَحَّى بكلامه الى كذا**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فحا) دێ.

**فَحَّى الطعامَ**: زۆر زەڵاتەو موقەبیلاتی هێنانە پێشەوە.

**فَاحَاهُ**: قسەی لەگەڵ فلان کرد ٥ ئەوەی نیگای بۆکرد تێی گەیاند.

**الفَحَا**: ئەو زەلاتەو موقەبیلاتو کەمونو زەردەچەوەو داوو دەرمانەیە بەخواردنەوە دەکرێ ٥ (ك: أفحاء).

**الفحوى**: (فحوى القول) ناوەڕۆكو مەبەستی قسەكە.

**الفَحوَةُ**: شانە هەنگوین کە هەنگوینەکە لە شانەکەدا مابێتەوەو نەپاڵێورابێ.

**فَخَت الطباخُ**: چێشت لێنەرەکە بەدەست پارچە گۆشتی لە مەنجەڵەکە دەرهێناو کەوگیری بەکار نەهێنا.

**فَخَت الشَّيْءَ**: شتەکەی بڕیەوە ٥ دەگوترێ: (فخت رأسه بالسيف) سەری بە شمشێرەکە پەڕاند.

**فَخَت السَّقفَ**: سەقفەکەی کون کرد.

**فَخَتَتِ الفاخِته**: کۆترەکە زۆری خوێند.

**فَخَتَت الفاخِتة**: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (فخت) دێ.

**الفاخِتَةُ**: جۆرە کۆترێکە لە ڕۆیشتن دا خێرا دەڕواو کەمێك باڵەکانی دەکاتەوەو خۆ بادەداو لارو لەنجە دەکا ٥ (ك: فواخت).

**فَخِجَ الرجلُ**: پیاوەکە لوتبەرزیی نواندو خۆی بەزل زانی.

**فَخَّتِ الأفعى فَخّاً وفخيخاً**: مارەکە فیشکاندی.

**فَخَّ النائمُ**: نوستووەکە پرخە پرخی هات (فهو أفخ وهي فخّاء).

**الفَخّ**: داوو تەڵە بۆ گرتنی دڕندەو باڵندەو شتی وا ٥ (ك: فِخاخ وفخوخ).

**فَخَذَهُ**: لە ڕانی دا، ڕانی هەنگاوت.

**فَخَّذ بين القوم**: خەڵکەکەی لێك دڕدۆم کردنو پەرتەوازەی کردن، کردنی بەدژی یەك.

**فَخَّذَ الرجلُ عشيرته**: پیاوەکە بنەماڵە دوا بنەماڵە بانگی هۆزەکەی کردو قسەی لەگەڵ کردن.

**تَفَخَّذَ عن الأمر**: لەکارەکەیدا دواکەوت.

**الفَخذُ والفَخِذُ**: ڕان لە ئەژنۆوە تا کلۆتی سمت ٥ بەرەبابێك لەهۆزو خێڵ ٥ (ك: أفخاذ).

**فَخَرَ الرجلُ**: پیاوەکە شانازی کرد بەسەروەریەکانی خۆی یان هی بنەماڵەو کەسو کاری ٥ لوتبەرزی نواند ٥ خۆی بەزلزانی.

**فَخَرَ الرَّجُلَ**: لە شانازیی کردندا بەسەر مرۆڤەکەدا زاڵ بوو.

**فَخِرَ فَخراً**: بێزی لێ کردەوە.

**أفخَرَ فلاناً على فلان**: فلانکەسی بەسەر فلاندا پاساو دایەوە فلانکەسی لە

فلان بەباشتر زانی.
فـــاخرَهُ مُفـــاخَرَةً: بەشـــانازی کـــردن بەرمنگاری بۆوە.
فَخَـرَهُ علیــه: بەســەر ئــەودا پاساوی دایەوە.
تفاخر: شانازیی کردو خۆی ڕانوانـدو خۆی هەڵنایەوە.
تفـاخر القـومُ: خەڵـکەکە هەندێـکیان شانازیان کرد بەسەر هەندێکیاندا.
إستفخر الطينُ: قوڕەکە بوو بە سواڵەت.
إسـتفخرَ الـشَّيْئَ: شـتەکەی بەجێـگای شانازی زانیو پەسەندی کرد.
الفاخِرُ: شتی بەنرخو بەها ٥ دەگوترێ: (نبات فاخر) ڕوەکێکی باشە ٥ (ثوب فاخر) پۆشاکێکی بەنرخە.
الفـــــاخور: ســـــواڵەت دروســــتکەر (گۆزەکەر).
الفـاخورة: کارگـەی سـواڵەت دروسـت کردن.
الفِخارة: پیشەی سواڵەت دروست کردن (کیتەڵەو گۆزەکەر).
الفَخّارُ: قاپو قاچاغی لە قوڕ دروست کراو وەکوو گۆزەو سوێنەو کیتەڵەو کوڵینەو شتی و ا.
الفَخّـــارِيّ: دیـزەو گـۆزە دروسـتکەر. سـواڵەت دروسـتکەر ٥ فرۆشـیاری سواڵەت.
المَفخرُ والمَفخرَةُ: جێـگای شانازیو خۆ هەڵنانەوە ٥ (ك: مفاخر).
الفَخفَخـةُ: فـەخر کـردن بـەبێ ئـەوەی حەقی فەخر کردنی هەبێ ٥ دەنگی خشانی کاغەز یان قوماشی تازە.
فَخُــمَ فَخامَـــةً: گــەورە بــوو، ڕێــزو شکۆمەندیی زیادی کرد.
فَخُمَ المنطقُ: ئاخاوتنی خۆش بوو.
فَخَّمَـهُ: گـەورەی کـرد ڕێـزی لێ گـرت، بەرزی کردەوە.
تَفَخَّمَهُ: بەمانا (فَخَّمَهُ) دێ.
الفَيخمـان: پیاوماقولو قسە ڕەوا: کـە بـــەبێ ئــــەو کارەکـــان بـــەکاڵا نەکرێنەوە.
فَدَحه الحِملُ فَدحاً: بارەکە ماندوی کـرد، کۆڵەکە برستی لێ بڕی.
فَدَحَهُ الدينُ: قەرزو قۆڵە کۆڵەی کوتاوە لەژێر قەرزدا دەناڵێنێ.
إسـتفدح الأمـرَ: کارەکـەی بـەقورسو گران زانیو تەواو ماندوی کرد.
الفادِحَةُ: بەڵاو کارەسات ٥ (ك: فوادح).
فَـدَخَ الـشَّيْئَ فـدخاً: شـتەکەی شـکاند ٥ بەزۆری بۆ شکاندنی شتی بۆشو نـاو کلـــۆرو تـــەڕ بەکاردەهێنـــدرێ ٥ دەگوترێ: (فَدَخَ الرأسَ وفَدَخَ البُسرُ).
فَدَّ فَدّاً وفَديداً: دەنگی بەهێز بوو، دەنگی تیژ بوو.

فَدَّ الطائر: باڵندەکە باڵەکانی لێك دانو کردنیەوە دەنگو ورشەی باڵەکانی هات.
فَدَّ الرجلُ: پیاوەکە بازی هاویشتو هەڵات ٥ ئەوەندە کەیف خۆشو تەڕ دەماخ بوو تەپەتەپی قاچی کە بەزەوی دەکێشا بەئاسانی دەبیسترا.
فَدَّدَ الرجلُ: پیاوەکە بەخۆبادانو لوت بەرزی ڕۆیی ٥ کاسبی بۆ ماڵو منداڵی کرد.
الفَدّادُ: دەنگ گەورەو ناخۆشو قسە قەمب.
الفَدّادة: بوّق.
الفَديدُ: دەنگە دەنگو هەراو هۆریا.
فَدَرَ فَدراً وفدوراً: شل بۆوە، هێواش بۆوە، نیشتەوە.
فَدَرَ الوعلُ: نێرییە کێویەکە لە کێودا ناخی بوو ٥ قەڵەوو خوباب بوو ٥ بەساڵاچوو.
فَدَرَ اللّحمُ: گۆشتە کوڵاوەکە سارد بۆوە.
فَدِرَ فَدراً: گێلو نەحمەق بوو.
أفدَرَ: بەمانا (فَدِرَ) دێ.
فَدَّرَ: بەمانا (فَدَرَ) دێ.
فَدَّرَ الحجارة: بەردەکەی شکاند.
تَفَدَّرَ الحَجَرُ: بەردەکە شکا.
الفادِرُ: بزنە کێوی پیر.
الفادِرَةُ: بەردی پتەوی سەر کێو ٥ لوتکە شاخی سەرکێو.
الفَدَرُ: حەیوانە کێوی ٥ بزنە کێوی.
الفَدِرُ من العیدان: دارو شوڕکی خۆش شکاو خێرا شکاو.
الفِدرَةُ: پارچەی شت ٥ دەگوترێ: (فِدرَةَ من اللحم) (وفِدرَةُ من التمر) ٥ (وفِدرَةُ من اللیل).
الفَدورُ: بزنە کێوی پیر.
المَفدَرَةُ: شوێنێك بزنە کێوی زۆری بێ.
فَدِعَ فَدعاً: دەستو قاچ خوارو خێچ جومزگە سوڕاو ٥ دەگوترێ: (فدعت یده أو قدمه) (فهو أفدع وهي فدعاء).
فَدَّعَهُ: دەستو قاچی خوارو خێچ کردن.
الفَدَعُ: خوارو خێچی لە جومزگەدا.
فَدَغَ الشَّيْءَ: شتەکەی شکاند، بەزۆری بۆ شتی بۆشو تەڕ بەکاردەهێندرێ.
فَدَّغَ الطعامَ: ڕۆنو چەوری بەخواردنەکەدا کرد.
إنفَدَغَ الشَّيْءُ: شتەکە بەهۆی وشك بوونەوەی نەرم بوو ٥ شکا.
فَدفَدَ: دەنگی بەرز بۆوە ٥ دەنگی تەپەتەپی هەنگاو هەڵێنانی هات، ئەوەندە کەیف خۆشو تەڕتەماخ بوو خێرا خێرا قاچی بەزەویدا داو هەڵپەڕی.
الفَدفَدُ: زەوی پانو پۆڕو سارای کاکی

بەكاكى كە هيچى تێدا نەبێ (ك: فداڧِد).

**الفَدفَدَةُ**: دەنگێكە وەكوو فيشكەى مار.

**فَدَمَ فاه**: (فدم على فيه) پەڕۆى خستە سەر دەمى، تۆپەوانەى لەدەمى هاخنى ٥ دەگوترێ: (فَدَمَ الإبريق وفدم الدابة).

**فَدَمَ المجوسي فَمَهُ**: كابراى ئاگر پەرست پەڕۆى خستە سەر دەمى خۆى وەكوو بەجێهێنانى ئەركێكى ئايينى تايبەتى خۆيان.

**فَـدُمَ فَدومـةً وفدامـةً**: تێگەيشتنى لاواز بـوو، بـۆڕى خـواردو بەڵـگەى بەدەستەوە نەما ٥ ئەحمەق‌و گێل بوو، قەڵەو و خەپە بوو ٥ (فهو فَدِمٌ) ٥ (ك: فِدام).

**أفدَمَهُ**: بەمانا (فَدَمَهُ) دێ.

**فَدَّمَ**: بۆ زێدەڕۆيى لەماناى (فَدَمَ) دێ ٥ دەگـوترێ: (فَـدَّمَ الإبريـقَ) زاركـى مەسينەكەى توند بەست.

**فَدَّمَ فاه**: دەمى توند بەست.

**فَـدَّمَ الـبعيرَ**: لغاوى حوشـترەكەى زۆر تونـد كـرد دەمبێنـى حوشـترەكەى توند كرد.

**فَـدَّمَ الثـوبَ**: ڕەنگـى سـورى زۆرى لـە قوماشەكە دا ٥ (فهو أفدم).

**الفِـدامُ**: ئـەو پەڕۆيـەى دەخرێتـە سـەردەمى شـت بۆئـەوەى شـتى تێيدايـە نـەڕژێ واتـە: تۆپەوانـە ٥ هەروا ئەو پەڕۆيـەى لـەدمى قاپ‌و گـۆزەو سـوراحى دەبەسـرێ بـۆ پالاوتنى شلەمەنى ناوى ٥ يان ئەو شـتەى تێـى دەگـرێ وەكـوو شـير پاڵێوك.

**الفِدامَةُ**: بەمانا (الفدام) دێ.

**الفَدِمُ**: (رجل فَـدِمٌ) پياوێـكى كـەودەن‌و نازيرەكـەو بەناخۆشـى تێـدەگا ٥ قوماشـى ڕەنـگ كـراو بـە ڕەنگـى سورى كەسكون.

**المُفَـدَّماتُ**: ئـەو گـۆزەو سوراحيانەى پەڕۆيان لە زاركى دەبەسترێ.

**فَدَّنَ الإبلَ**: حوشترەكەى قەڵەو كرد.

**الفدّان**: ئامێرى كێلان ٥ نيرى جوت كە دەخرێتە سەر ملى دووگا يان دوو هێسـتر هـەوجارو مـزان‌و ئـامێرى جـوت كردنـى لێ شـەتەك دەدرێ ٥ پارچـەيەكە لـە زەوى لـە ولاتـى ميصر بـە (٤٢٠٠ مـەتر چوارگۆشە) مەزندە دەكرێ.

**الفَدَنُ**: باڵەخانە ٥ (ك: أفدان).

**فداه فَدىً وفِدىً وفِـداءً**: بـەماڵ‌و سامان ڕزگارى كـرد، بـەدەڵى دا، دەگـوترێ: (فداه بمال) ٥ (وفَداه بنفسه).

**أفدى**: جەستەى گەورە بوو.

**أفـدى صَـفِيَّه**: منداڵەكـەى خـۆى هەڵبەراند.

أفـــدى فلانـــاً أســـيره: بـــەدەڵی لەبەندییەکەی وەرگرت.

فـاداه مفـاداة وفـداءً: فیدیـەی بـۆدا ٥ فیدیەی لێ قبوڵ کرد.

فادى الأسرى عنـده: بەندییـەکانی لای خۆی ئازادکردن لەبەرامبـەر ئـەوەدا دوژمن ئەوەندە بەندی ئـەوان ئـازاد بکا.

فَـدّاهُ بنفـسه: فیدیـەی بـۆداو بـەماڵ ڕزگـاری کـرد ٥ یـان وتـی: کـردم بەقوربانی تۆ.

إفتدى: لەجیاتی خۆی فیدیەی دا.

إفتـــدى الأســـير: بـــەماڵو ســامان بەندییەکەی کڕیەوە.

تفـادى القـومُ: خەڵـکەکە هەندێـکیان فیدیەیان بۆ هەندێکیان دا.

الفِداءُ: ئـەو مـاڵو سامانەی دەدرێ بـۆ ئازاد کردنی گـیراو ٥ یـان ئـەوەی لـە ڕێگای خودادا دەبەخشرێ لە پاساو و بارتـەقای کەمتەرخەمییـەك لـە خـودا پەرسـتی دا وەکـوو کـەفارەتی ڕۆژو و تاشـــینی مـــوو لـــەکاتی ئیحرامـــدا، لەبـــەرکردنی پۆشـــاکی دوراو لەکاتی ئیحرامدا ٥ قوربانی.

الفدائي: پێشمەرگە لە ڕێبازی خـودادا یـان لـە پێنـاو زێـدو نیـشتمان دا گیانی خۆی دەبەخشێ.

الفِديَـةُ: بـەمانا (الفِـداء) دێ ٥ (ك: فِدىً).

فَذَّ عن اصحابه فَذّاً: لـە هاوەڵەکانی جیا بـۆوەو تـەنیا کەوتـە دەشـتێ ٥ دەگـوترێ: (فَـذَّ عـن نظرائـه) لـە هاوەڵەکانی جودا بۆوە.

فَذَّ فلانـاً: فلانکەسی دەرکـرد بـە تونـدو تیژی وەدەرێی نا.

أفَذّت الشاةُ: مەڕەکە بێچویەکی بـوو، دولانـــەی نـــەبوو ئەمـــە کاتێـــك دەگوترێ کە مەڕەکە هـەموو ساڵێ دولانەی بووبێ.

أفَـذّ القـومُ: خەڵـکەکە یـەك یـەك بەشوێن یەکتردا هاتن.

تَفَـذّذ بـالأمر أو برأيـه: تـاکڕەوی و دیکتـاتۆری نوانـد لەکارەکـەدا یـان سوور بوو لەسەر ڕای خۆی و گوێی بەقسەی کەس نەدا.

الأفَذُّ من السهام: تیری بێ پەڕو باڵ.

الفَـاذّةُ: دەگـوترێ: (کلمـــة فـــاذة) وشەیەکی شازو نایاساییە.

الفُذاذى: دەگوترێ: (جاء القوم فذاذى) خەڵـکەکە تاکتـاك هـاتن و یـەك لەدوای یەك هاتن.

الفُذاذ: تاکتـاك و یـەك لـەدوای یـەك ٥ دەگـوترێ: (جـاء القـوم فـذاذاً) خەڵکەکە یەك یەك هاتن.

**الفَذُّ**: تاك ٥ تەنیا لەشوێنی خۆیو دابینکردنی پێویستیاتی خۆی ٥ یەکەم قوداحی قوماری مەیسیر ٥ خورما وشکەڵ ئەو جۆرە خورمایەی کە پێکەوە نانوسێن ٥ (ك: أفذاذ وفذوذ) ٥ دەگوترێ: (جاء القومُ أفذاذاً) یەك یەك خەڵکەکە هاتن.

**الفَذَّةُ**: شازو ناوازەو دەرچوو لە قاعیدە.

**الفُذاذُ**: بەمانا (الفُذاذُ) دێ.

**المِفذاذُ**: ئەو مەڕەی عادەتی وایە تاك بێچوی دەبێو هەرگیز دولانەی نەبووە.

**فَذلك الحسابَ**: حیسابەکەی کۆتایی پێ هێناو لێی بۆوە.

**الفَذلَكةُ**: کورتەی باسو خواصەکە.

**الفَرَأُ**: کەرەکێوی.

**الفَرَاءُ**: بەمانا (الفَرَأُ) دێ.

**الفَرِيءُ**: هەڵبەستراو ٥ دەگوترێ: (أمر فَرِيءٌ) روداوێکی هەڵبەستراوەو بێ بنەمایە ٥ (أمرٌ فَرِيءٌ) کارێکی گەورەیە.

**فَرَثَ فَرثاً**: تاوانی کردو بێ دین بوو.

**فَرِثَ الرجلُ فَرَثاً**: پیاوەکە عەقڵی لاواز بوو دوای ئەوەی عەقڵی تەواو کامڵ بوو عەقڵی لاواز بوو.

**فُرُتَ الماءُ فُروتَةً**: ئاوەکە زۆر شیرینو گوارا بوو (فهو فُرات).

**الفرات**: ئاوێك زۆر شیرینو گوارا بێ ٥ دەگوترێ: (ماء فرات ونهر فرات).

**فَرتَكَ**: بەهەنگاوی کورت کورت رۆیشت.

**فَرتَكَ الشَّيْءَ**: شتەکەی وردو هاڕ کرد.

**فرتكَ النسيجَ ونحوه**: چنراوەکەی هەڵوەشاندەوەو خراپی کرد.

**فَرتَنَ**: بەهەنگاوی کورت کورت رەوی کرد.

**فَرتَنَ في كلامه**: زۆری قسەکردو قسەی لەقسە دەرهێنا.

**فَرتَنى**: ئافرەتی داوێن پیس ٥ چەتیوەو کارەکەر.

**الفَرتنى**: بێچوی کەمتیار ٥ ئافرەتی داوێن پیسو چەتیوە.

**فَرَثَتِ الحُبلى فَرثاً**: ئافرەتە دووگیانەکە تەنگە نەفەس بوو بەهۆی قورسایی سکەکەی.

**فَرَثَ الكرِش**: گەدەی هەڵدڕیو پاشماوەی خواردنەکەی لێ دەرهێنا.

**فَرَثَ وعاءَ التمر**: سەبەتە خورماکەی شەق کرد هەرچی خورمای تێدا بوو بڵاو بونەوە ٥ دەگوترێ: (فَرثَ الحُبُّ كبِدَهُ) عیشقو ئەوین دڵو جەرگی فلانی لەتلەت کردوە.

**فَـرِثَ الرجلُ فَرَثـاً**: پیاوەکـە تێـر بـوو ٥ دەگوترێ: (شـرِبَ علـى فَـرِث) لەسەر تێری خواردیەوە.

**فَرِثَ القومُ**: خەڵکەکە پەرتەوازە بوون.

**أفرَثَ الكرِثَ**: بەمانا (فَرَثها) دێ.

**أفـرَثَ الرجـلَ**: تانـەو تەشـەری لـە پیاوەکەدا، زەبری لێ وەشاند.

**أفـرَثَ أصـحابَه**: بـە فیتننـەیی و دووزمانی هاوەڵەکانی خۆی خستنە نـاو گێـژاو و چـورتمەوە ٥ وای لێ کـردن بکەونـە بـەر تانـەو تەشـەری خەڵك.

**إنفَرَثَت الحُبلى**: بەمانا (فَرَثت) دێ.

**تَفَرَّثَ القومُ**: خەڵکەکە پەرتەوازە بوون ٥ (تَفَرَّثَـت الحبلـى) ئافرەتـە دووگیانەکـە بـەهۆی قورسـی سکەکەیەوە تەنگەنەفەس بوو.

**الفُراثَةُ**: باقی ماندەی خۆراك لەگەدەدا.

**الفَـرثُ**: بـەمانا (الفُراثَـةُ) دێ ٥ قورئـان دەفەرموێ: ﴿نُسقِيكُم مِمَّا فِي بُطُونِـهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًـا خَالِـصًا سَـآئِغًا لِلشَّارِبِينَ﴾.

**الفَرِثُ**: تێرو تەسەل ٥ (المكان الفَـرِثُ) شوێنێـك نـە کێـو و کـەژ بـێ نـە دەشتایی بێ.

**فَـرَجَ بـين الـشيئين فرجـاً**: درزو قەڵشتی خستە نێوان دوو شت ٥ یان شتەکەی شەق کرد ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا السَّمَاءُ فُرِجَتْ﴾: کاتێـك ئاسمان شـەق بوو، درزی برد.

**فَـرِجَ القـومُ لـه**: خەڵـکەکە ڕێـگەیان بـۆ دڕدا، شوێنیان بۆ فراوان کرد.

**فَرَجَ اللهُ الغمَّ**: خودا غـەم و ناخۆشیەکەی لابرد.

**فَرِجَ فَرَجاً**: شـەرمگای دەرکـەوت ٥ ترسـاو تاسا ٥ سمتی گەورە بوون.

**فَرِجَـت ثنايـاهُ**: ددانـی پێـشەوەی شـاش بوون ٥ بۆشایی کەوتە نێوانیانەوە ٥ (فهو أفرج وهي فرجاء).

**فَرُجَ فَراجَةً**: نهێنی نەپاراست.

**أفـرَجَ الغُبـارُ**: تـەپو تۆزەکـەی لاچوو نەما.

**أفرَجَ القَومُ عن المكـان**: خەڵـکەکە لـەو شوێنە دەرچوون.

**أفـرَجَ عـن الحبـيس**: بەندییەکـەی مەرەخەس کرد ٥ دەگوترێ: (أفـرَجَ عن الأسير أفرَجَ عن المال).

**أفرَجَت الدجاجَـةُ**: مریـشکەکە جوجکی هەڵێنان.

**فَـرَّجَ الـشَّيئَ**: شـتەکەی فـراوان کـرد.

**فَـرَّجَ اللهُ الغـمَّ**: خـودا خـەم و خەفەتەکەی لابردو ڕەواندیەوە.

**إنفَـرَجَ الـشَّيئُ**: شتەکە فـراوان بـوو ٥ دەگوترێ: (إنفـرجَ مـا بـين الـشيئين) درزی نێوان دوو شتەکە فراوان بوو.

إنفَـــرَجَ الغَـــمُّ والكَـــربُ: غــــەمو نارەحتیەکان ڕەوانەوەو نەمان.

تَفَـرَجَ الرجـلُ بكـذا وعليــه: پیاوەکـە تەسـەللای هـاتو خـەمو پـەژارەی ڕەوینــەوە، بــەو گــەڕانو تەماشــا کردنە غەمەکانی بەبادا.

التفـارِجُ: (تفـارج الأصـابع) بۆشـاییو درزی نێوان پەنجەکان.

الفَرجُ: درزو قەوارەی نێوان دووشـت ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿وَمَـا لَهَـا مِـن فُـــرُوجٍ﴾: ئاسمـــان هـــیچ درزو قــەوارەی تێـدا نیــە ٥ هــەروا بــە کینایـــــەو درکــــە بەشـــــەرمگای ئـادەمیزاد دەگـوترێو بـەزۆری بـۆ ئەو وانێـکو هینـەی پیـاوو ئـافرەت بــەکاردێ ٥ قورئـــان دەفـــەرموێ: ﴿وَالَّتِـي أَحْـصَنَتْ فَرْجَهَــا﴾ ٥ یـان دەفـەرموێ: ﴿وَالَّذِينَ هُـمْ لِفُـرُوجِهِمْ حَافِظُونَ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ سەنگەرو بەندەنی ترسناك ٥ (فـروج الأرض) ئـــەملاو ئـــەولای زەویو کـــونو کەلەبەری.

الفَــرَجُ: لاچــوونی خــەمو خەفــەتو چورتمو ناخۆشی.

الفُـرُجُ مـن الرجـال: پیاوێـك نهێنـی لا نەمێنێتەوە.

الفُرجَةُ: درزو کەلەبەری نێوان دوو شت ٥ لاچونی غەمو ناخۆشی ٥ بینینـی شتی غەم ڕەوێن.

الفَرَجِيَّـــةُ: جبــەی پیــاو ی ئــایینی پۆشاکێکی پانو قۆڵ درێـژە پیـاوی ئایینی لەبەری دەکا.

الفَــرُوجُ: کراسـی بــچوك ٥ جوجـك؛ بێچوی مریشك.

الفَرِيجُ: کەوانێـك ژێیەکـەی لێ ترازابێ ٥ مێینەیـەك زۆری منـداڵ بـووبن ٥ شـتی بـەدەرەوەو ئاشـکرا بـۆ نێـرو مێ.

الْمُفــرَجُ: کوژراوێـــك نەزانــدرێ کـێ کوشتویەتی ٥ مرۆڤی بێ کەسو بێ دەر نە نەوەی هەبێ نە هۆزو خـێڵ نەماڵو سامان.

الْمُفَــرَّجُ: شـانە ٥ کەسێـك بـن هـەنگڵی پانو پۆڕ بێ.

ألزاوية المنفرجة: زاوییەی کراوە: کە لـە نەوەد دەرەجە زیاتر بێ.

الفِرجَــارُ: پـەرگاڵ؛ پـەرگار ئامێرێــکە دووقاچی هەیـە کەوانـەو شتی وای پێ ڕەسم دەکرێ.

فَرجَنَ الدَّابَـةَ: وڵاخەکـەی ڕنـەك کـرد ٥ بـە ڕنـەك پێـستی وڵاخەکـەی پـاك کردەوە.

فَــرجَنَ الثـوبَ: بـە فلّچە کراسـەکەی خاوێن کردەوە.

الفرجَـونُ: ئامێرێـکە لـە ئاسـن وەکـوو

شانە ددانی بۆ کراون ولاخی پیّ
ڕنەك دەکریّ ٥ بە کوردی پیّی
دەگوتریّ: ڕنەك.
**فَرِحَ فَرَحاً**: کەیف خۆش بوو، ڕازی بوو
لەحەدیس دا هاتووە: (للهُ أشدّ فَرَحاً
بتوبة عبده) ٥ دەشگوتریّ: (فَرِحَ بكـذا)
بەو شتە کەیف خۆش بوو.
**أفرَحَهُ**: کەیف خۆشی کرد.
**فَرَّحَهُ**: کەیف خۆشی کرد.
**المِفرَاحُ**: بۆ زێدە ڕۆیی لەمانای (فَـرِحَ)
دیّ.
**المُفرَحُ**: کەسێك قەرزداربیّ قەرز شانی
گرتبیّو نەتوانیّ بیداتەوە.
**أفرَخَ الطائِرُ**: باڵندەکە بێچوی بوون.
**أفرَخَت البیضةُ**: هێلکەکە شکاو جوچکی
لیّ هاتە دەر.
**أفرَخَ الزرعُ**: کشتو کاڵەکە پەلو پۆی
کردن.
**أفـرَخَ فـؤادُهُ**: دڵی ئارام بوو خەمو
خەفەتی تێدا نەمان.
**أفرَخَ رَوعُهُ**: دڵی بی خەم بوو.
**أفـرَخَ الأمـرُ**: کارەکە دوای چەواشەیی
مەعلوم بوو دەرکەوت چۆنەو چۆن
نیە.
**أفـرَخَ الله روع فـلان**: خـودا خـەمو
خەفەتی لە دڵی فلاّن لابرد.
**أفرَخَ القومُ بیضتهم**: خەڵکەکە نهێنی
خۆیان ئاشکرا کرد.
**فَرَّخَ الطائِرُ والبیضةُ والزرعُ**: باڵندەکە
بێچوی هەڵێنان ٥ هێلکەکە جوچکی
لیّ هاتە دەر کێڵگەکە جوچکی تێدا
پەیدا بوو.
**فَرَّخَ القومُ**: خەڵکەکە ترسانو زەلیل
بوون.
**فَـرَّخَ الأمـرُ**: کارەکـە دوای چەواشـە
بوونی ئاشکرا بوو واقیعەکەی ڕوون
بۆوە.
دەگـوتریّ: (بـاض الـشیطان في رأسـه
وفَـرَّخَ) شـەیتان گـەرای لەسـەری
دانایەوەو گومڕای کرد.
**إسـتَفرَخَ الطـائرُ**: باڵندەکـەی ڕاگـرت
بۆئـەوەی هێلکـەی بـۆ بکـا ٥
جوچکەی بۆ بەرهەم بێنیّ.
**الفَـرخُ**: لـە بنەڕەتـدا نـاوە بـۆ بێچوی
باڵنـدە، جوچـکی پەلـەوەر بێـچوی
هەموو هێلکە کەرێـك ٥ هـەروا نـاوە
بـۆ هـەموو بێـچوی بـچکۆلەی
گیانداران ٥ بۆ نەمامی درەخت ٥ بۆ
پیـاوی زەلیـلو ژێـر دەسـتە ٥
بـەروبوومی کـشتو کـاڵ کـە زاری
کردبێتەوەو دەنکەکەی دەرکەوتبیّ
٥ پێشەوەی دەماغ.
**فِراخ الشجرة**: ئەو خەڵفو چرۆیەیە
کەلەسـەر بنکـی درەختـی بـڕاودا
هەڵدەداتەوە.

**الفَرخَةُ:** نوكه ڕمبی پان.

**الفَرّوخُ من السنبل:** ئەو دانەوێڵەیە لە گوڵەکەیدا دەرکەوتبێ ڕەق بووبێ.

**المَفارِخُ:** شوێنی جوجك هەلێنان، کێلگەی پەلەوەر هەلێنان ٥ تاکەکەی: (مَفرَخ ومفرَخَة).

**فَرَدَ بالرأي:** سوور بوو لەسەر ڕای خۆیو تاکڕەو بوو.

**أفردت أنثى الحيوان:** حەیوانەمێینەکە یەك بێچوی بوو ئەمە کاتێك دەگوترێ: کە حەیوانەکە عادەتی وابێ زیاد لە بێچویەکی ببێ.

**أفرد بالأمر:** تاکڕەو بوو لەکارەکەیدا.

**أفردَ الشَّيْئَ:** شتەکەی تاك کرد وای لێ کرد تاکە شت بێ ٥ جیای کردەوە ٥ دووری خستەوە.

**أفـرَدَ اليـه رَسـولاً:** پیاوێکی بۆ نارد بەتەدارەكو پێویستیاتەوە.

**فَـرَّدَ الرجـلُ:** پیاوەکە تێگەیشت ٥ لەخەڵك گۆشەگیر بوو چووە خەڵوەوە بۆ خودا پەرستی ٥ لەحەدیسدا هاتووە: (طـوبى للمفرِّدين).

**فَرَّدَ برأيه:** سوور بوو لەسەر ڕای خۆیو تاك ڕەویی ڕەچاو کرد.

**فَـرَّدَ الـذهب:** دەنکە ئاڵتونەکانی لە ملوانەکەکەدا بە میروی زیوو شتی وا جیاکردەوە، واتە: هەموو میروە ئاڵتونەکانی نەخستنە پەنا یەکترەوە بەڵکوو بە دەنکە مرواریو بەردی گرانبەهاو دەنکە زیو ناوانی کردن.

**فَـرَّدَ الـشَّيْئَ:** شتەکەی کردە چەند تاکێك.

**فَـرَّدَ الأشـياء:** شتەکانی لێك دوور خستنەوە؛ ناوانی کردن بەشتی تر.

**إنفَرَدَ بالأمر:** بەتەنیا کارەکەی خستە ئەستۆی خۆی دیکتاتۆریی نواندو تاکڕەوی تێدا کردو نەیهێشت کەس هاوبەشی بکا.

**أنفـردَ بنفـسه:** گۆشەگیر بوو خۆی لەخەڵك جیاکردەوە.

**تَفَرَّدَ بالأمر:** بەمانا (إنفردَ) دێ.

**إستفرد بالأمر أو الراي:** تاك ڕەویی کرد لە کارەکەی دا نەیهێشت کەسی تر هاوبەشی بکەن ٥ سوور بوو لەسەر ڕای خۆی ڕای تری قبوڵ نەبوو.

**إسـتفردَ فلانـاً:** بەتەنها لەگەڵ فلاندا کۆبۆوە ٥ فلانکەسی بەتەنیا بینی.

**إستفردَ الغوّاصُ هذه الدُرَّةَ:** مەلەوانەکە ئەو گەوهەرەی بەتەنیا دەست کەوت هیچی تری لەگەڵ نەبوو.

**إسـتَفرَدَ الـشَّيْئَ:** شتەکەی بەتەنیا هەڵگرتو هیچی تری لەگەڵ نەبوو.

الإفـرادُ في النحـو: لـەزاراوەی نـەحودا ئیفراد ئەوەیە تـەثنیـەو کۆنـەبێ ٥ لـە بـواری شـەرعدا ئیفـراد ئەوەیـە حـاجی ئیحـرام بەحـەجو عـەمرە بەیەکەوە نەبەستێ ٥ واتـە بـەجیاو یـەك لـەداوی یـەك ئیحرامیـان بـۆ ببەستێ.

الفارِدُ: تەنیا، تاقەوە بوو ٥ تەرە بوو ٥ دەگـوترێ: (ثور فـارِد) کەڵەگاکـە لـە گا ڕانەکە جیا بۆتەوە، تاکەوە بـووە ٥ (شـجرة فـاردة) درەختێـکە لـە درەختەکانی تـر جیا بۆتـەوە، دوور لەپەڵـە درەختـەکان ڕواوە ٥ (ناقـة فـاردة) حوشـترەکە لـە لـەوڕگاو دوێـڵاودا شـوێنی جیایـە ٥ (شـاة فـاردة) مەڕێـکە بـەجیا لەماڵـەوە دەدۆشـرێ ٥ هـەروا وشـەی (الفـارِد) ناوە بـۆ شـەکری زۆر سپی ٥ هـەروا ناوە بۆ حوشـترە نێـرەی زۆر کەتـەو بەهێز.

فُرادَ: دەگـوترێ: (جاء القومُ فُرادَ وفراداً وفرادی) خەڵکەکە یەکیەك هـاتن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ جِئْتُمُونَا فُرَادَى كَمَا خَلَقْنَاكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ﴾.

الفـرد: تـاك ٥ تاکـەوە بـوو بـۆ مێینـە دەگـوترێ: (الفَـرْدَةُ) ٥ قورئـان دەفـەرموێ: ﴿رَبِّ لَا تَذَرْنِي فَرْدًا وَأَنتَ خَيْرُ الْوَارِثِينَ﴾ ٥ هەروا ناوە بۆ کەسانێك گۆشـەگیر دەبن لەکۆمـەڵ جیادەبنەوە.

الفَـردانُ: تـاك، تـەنها، بـۆ مێینـە دەگوترێ: (فَردی).

الفَردَةُ: تەپۆڵکە ٥ (ك: فُردات).

الفُردَةُ: کەسێك زۆر گۆشـەگیر بی زۆر خۆ تاق بکاتەوە.

الفَردِیـةُ: تـاکرەوی، دیکتـاتۆری ٥ ڕێبازێـکی ڕامیارییـە دەسـەڵات دەداتـە دەسـت تـاكو بـڕوای بـە ڕێکخراوی جەماوەریی نیە.

الفَـرّادُ: فرۆشیاری گەوهـەری بـەنرخو بـەها، مـرواری ٥ ئـەو کەسـەی ملوانکەی گەوهەر دروست دەکا.

الفُرُودُ من الأشیاء: تاك ٥ تاقانە.

الفُرُودُ: ئەو ئەستێرانەن کـە بـەدەوری ئەستێرەی (سورەیا) سیوەیلەوەیە ٥ (فُرُودُ النجوم) تاکە ئەستێرەکان.

الفریـدُ: تـاكو تـەنها ٥ تاقانـە ٥ دەنکە مرواری زیو و شتی تری تی بکەوێ ٥ تاکەکەی پێی دەگوترێ: (فریدة) ٥ گەوهەری بەنرخو بەها.

المِفرادُ من النوق: حوشـتری تاقـەوەبوو، تەرە بوو.

المُفردُ: کەڵەگا کێوی ٥ لە بـواری وشـەدا (مُفرد) وشەیەکە بەشێك لە وشەکە

بەشێــك لەماناكــەی ناگەیــەنێ ٥ بەڵكو هەموو وشەكە دەلالـەت دەكا لەسەر ماناكەی.

**المُفَــرَّدُ**: دەگـوترێ: (راكــب مُفَــرَّدٌ) سوارێــكە خــۆیو حوشــترەكەیەتی كەسی تری لەگەڵدا نیە.

**فَردَسَ الكَرمَ**: پەلو پۆی مێوەكەی لێـك بلاو كردنەوەو كەپری بۆ كرد.

**فَردَسَ قِرنَهُ**: هاوشانەكەی خۆی بەزویدا دا بۆڕی دا.

**فَــردَسَ وِعــاءَ التمــر**: بەچـنەو پوشـی خورماكەی ناواخن كـردو زۆری تـێ پەستاوت.

**الفُــرَادِسُ**: دەگـوترێ: (رجــل فُــرادسٌ) پیاوێـكی نێسقان ئەستورە.

**الفردَسَةُ**: پانو پۆڕ.

**الفُردُوسُ**: زێدەزۆری گەنمو شتی وا.

**الفِــردَوسُ**: باغێــك كـە هـەموو جـۆرە میوەیەكی تێدا بێ ٥ شوێنێك زۆری درەختی مێو لێ بێ ٥ ناوی باغێــكە لــە باغــەكانی بەهەشـــت ٥ (ك: فرادیس).

**فَرَّ فَرّاً فِراراً**: هەلات.

**فَــرَّ الیــه**: پــەنای بــۆ بــرد ٥ قورئــان دەفەرموێ: ﴿فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ﴾.

**فَرَّ**: پەلەی كرد خێـرا ڕۆیـی ٥ دەگـوترێ: (فَــرَّ الفــارسُ) سوارچاكەكە مـەودای ڕۆیـشتنەكەی فـراوان كـرد بۆئــەوەی بەئاسانی كەوانەیی بگەڕێتەوە.

**فَرَّ فلانٌ**: فلانكەس تاقی كراوەو قاڵبوو.

**فَرَّ الدابَّةَ**: ددانی وڵاخەكـەی سـەیر كـردن بزانـێ ئـاخۆ شیلەی مـاون، پیرە یـان گەنجە، تەمەنی چەند ساڵە.

**فَرَّ الأمــرَ**: لێـكۆڵینەوەی لەكارەكـەدا كـرد بۆئـەوەی بزانـێ چـۆنەو چـۆن نیـە ٥ دەگـوترێ: (فَــرَّ فــلانٌ عمــا في نفــسه) پرسیار لە فلانكەس كرا بۆئەوەی چی لە دڵی دایە دەری بخا.

**أفَرَّتِ الدوابُ**: وڵاخەكە ددانـی كـەوتن بۆئــەوەی لــە شــوێنیان ددانــی تــر بڕوێنەوە.

**أفَرَّ فلاناً ونحوه**: وای لێ كـرد فلانكـەس هەڵبێ.

**أفَرَّ رأسَــهُ بالــسیف**: سـەری بـە شمـشێر لەت كرد.

**فارَرتُــهُ**: ئــەو لــەوەزعو حــاڵی منــی كۆڵیەوە منیش لەوەزعو حاڵی ئەوم كۆڵیەوە.

**إفتَــرَّ الــبرقُ**: هــەورە بروســـكەكە مەشخەڵی دا.

**إفتَرَّ فلان**: فلانكـەس پێـكەنیو ددانـی دەركەوتن ٥ دەشگوترێ:

**إفتَـرَّ عـن اسـنانه ضـاحِكاً**: لەحاڵـەتی پێكەنیندا ددانی دەرخستن.

شکان ○ (فهو أقضم وهي قضماء).

**قَضِمَ السيف:** شمشێرەکە تیژاییەکەی شکا، کول بوو ○ (فهو قَضِمٌ وقَضيمٌ).

**أقْضَمَ القومُ:** خەڵکەکە کەمیان بژێو پەیدا کرد بۆکاتی قاتو قڕی.

**أقضم الدابَّةَ:** هەرزنی کرد بەئالیکی وڵاخەکە.

**قاضَمَ فلان مقاضَمةً:** فلانکەس کەم کەم شتی کڕی، کەمێکی کڕیو پارەکەی دا، ئەمجار کەمێکی تری کڕی هەروا بەو جۆرە واتە: بەجوملەو کۆ شتی نەکڕی.

**إسْتَقْضَمَ القومُ:** خەڵکەکە بژێوی کەمو خراپیان بۆ کاتی گرانی پەیدا کرد.

**القَضامُ:** هەر شتێك کەرت بکرێو بهاڕدرێ وەکوو جۆ و هەرزنو نۆكو شتی وا ○ دەگوترێ: (ماذقت قَضاماً) من دەنکە هەرزنێکم چەشت نەکردووە.

**القُضَامُ:** درەختی خورما درێژ ببێو بەرەکەی خورما وشکەڵ بێ یان کەم بەر بگرێ.

**القُضْمَةُ:** بەمانا (القُضامُ) دێ ○ دەگوترێ: (ماذقت قُضْمَةً).

**القَضيمُ:** بەمانا (القُضام) دێ ○ دەگوترێ: (ما ذقت قضيماً) ○ کەوڵی ڕاخستن ○ پێستی سپی کەلەسەری بنووسرێ ○ شمشێری کۆن کەتیژایی نەمابێو کەڵکی تێکەوتبن ○ پەڕەی سپی.

**قَضَى قَضْياً وقَضاءً وقَضِيَّةً:** بڕیاری دا، حوکمی کرد، کێشەکەی بەکاڵا کردەوە ○ دەگوترێ: (قضى بين الخصمين وقضى عليه وقضى له وقضى بكذا ○ فهو قاضٍ).

**قضى اللهُ:** خودا فەرمانی کرد.

**قضى اليه:** فەرمانی گەیاندە ئەو ○ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ﴾: فەرمانمان ئاراستەی نەتەوەی ئیسرائیل کرد.

**قضى الصلاةَ:** نوێژی کرد ○ یان دوای تێپەڕبوونی کات، نوێژەکەی گێڕایەوە.

**قضى الدينَ:** قەرزەکەی دایەوە.

**قضى عَبْرَتَهُ:** فرمێسکی خۆی هەڵڕشتنو فرمێسکی لەچاواندا نەمان.

**قضى الشَّيْءَ:** شتەکەی مەزەندە کردو دروستی کرد.

**قضى حاجته:** ئیشی خۆی جێبەجی کرد.

**قضى أجَلَهُ:** گەیشتە ماوەی بۆ دیاریی کراوی خۆی.

**قضى نَحبَهُ:** مرد ○ دەشگوترێ: (قضى فلان) فلان مرد (ضربه فقضى عليه) لێی داو کوشتی.

**قاضاه مقاضاةً:** دادگایی کرد.

**قاضاهُ على مال:** لەسەر ماڵ صوڵحی

لەگەڵدا کردو رێك کەوت.
**قضى حاجَتَهُ تَقضِيَةً**: ئیشی خۆی ئەنجام دا.
**قضى الأميرَ فلاناً**: پاشا فلانکەسی کرد بە قاضی.
**قضى أمرَهُ**: کاری خۆی ڕۆیاند.
**إقتضى الدينَ**: داوای قەرزەکەی خۆی کردەوە.
**إقتضى أمراً**: کارەکەی پێویست کرد.
**قضى الأمرُ الوجوبَ**: فەرمانەکە مانای واجب بوون دەگەیەنێ.
**إنقضى الشَّيْئُ**: شتەکە تەواو بوو بەسەر چوو ٥ دەشگوترێ:
**إنقضى أجَلُهُ**: تەمەنی تەواو بوو ژیانی بەسەرچوو.
**تقاضاه الدَّيْنَ**: داوای قەرزەکەی لێ کردەوە ٥ قەرزەکەی لێ وەرگرتەوە.
**تَقَضّى الشَّيْئُ**: شتەکە تەواو بوو بەسەرچوو ٥ دەگوترێ:
**تقضّى عُمْرُهُ**: تەمەنی تەواو بوو.
**إسْتَقضى السلطانُ فلاناً**: پاشا فلانکەسی کرد بە قاضی.
**إستقضى فلان فلاناً**: فلانکەس داوای بڕیارو حوکمی فلانی کرد یان فلانکەس داوای کرد فلان پەلکێشی دادگا بکەن.
**إسْتَقضى فلان الدينَ**: فلانکەس داوای کرد قەرزەکەی بدرێتەوە.
**القاضي**: دادوەر ٥ یەکالەکەرەوەی شت بڕیاردەر دەربارەی کێشە ٥ کەسێك بەگوێرەی شەریعەتی خوا بڕیار بداو حوکمو بڕیار دەربکا ٥ کەسێك فەرمانڕەوا دایبمەزرێنێ بەدادوەر بۆئەوەی بڕوانێتە کێشەو نیزاعی نێوان خەڵكو بەگوێرەی قانونو یاسا کێشەکان یەکالابکاتەوە ٥ دەشگوترێ: (سمٌّ قاضٍ): ژەهری کوشندە.
**القاضِيَةُ**: مردن ٥ (ضَرْبَة قاضية) زەبری کوشندە.
**القَضَاءُ**: بڕیار ٥ بەجێهێنان ٥ کاری دادوەر ٥ پیاوانی یاسا ٥ لیژنەی یاسایی: کەیەکالا کردنەوەی کێشەی هاو ولاتیانیانی دەخرێتە ئەستۆ ٥ دەشگوترێ: (وقع هذا الحادث قضاءً وقدراً) ئەم ڕوداوە بەقەزاو قەدەر ڕوی داو بەئەنقەست نەبوو.
**القُضاة**: پێستێکی تەنکە لەسەر دەمو چاوی منداڵ دەبێ لەکاتی لەدایکبوونی دا.
**القضية**: حوکمو بڕیار ٥ مەسەلەیەکە کێشەی تێدایە دەخرێتە بەردەم دادوەر یان لیژنەی یاسایی بۆئەوەی یەکالای بکەنەوە ٥ لەزاراوەی

مـەنتيق دا (قَـضِيَّة) بريتيـە لـە ڕستەيەك پێك هاتبێ لە (موضوع) و (محمول) كە ئەو ڕستەو هەواڵە لـەخودى خـۆى دا ئەگـەرى ڕاسـتى يان درۆى تێدا چاوەڕوان بكرێ.

**قَطَـبَ فـلان قطوبـاً**: فلآنكـەس بـرۆى هێنانەوە يەكو ڕوى خۆى گـرژ كـرد ٥ دەشگوترێ: (رأيته غَضْبانَ قاطِباً).

**قَطَـبَ فلانـاً**: فلآنكەسى ڕەنجانـد، ڕقـى هەڵساند.

**قَطَبَ الشَّيْءَ قَطْباً**: شتەكەى كۆكردەوە.

**قطب الشرابَ**: شەرابەكەى تێكەڵ كرد.

**أقطبَ القومُ**: خەڵكەكە كۆبوونەوە.

**أقطـب الـشرابَ**: شـەرابەكەى تێـكەڵ بەشتى كە كرد.

**قَطَّـبَ الرجـلُ**: بـەمانا (قَطَـبَ) دێ ٥ دەگـوترێ: (قَطَّـبَ بـين عينيــە) ناوچەوانى وێكهێناو ڕوى گرژ كـرد ٥ (قَطَّبَ وَجْهَهُ) ڕوى گرژ كرد.

**قَطَّبَ الشرابَ**: شەرابەكەى تێكەڵ كرد.

**الإستِقطاب**: حاڵـەتى كۆبوونـەوەى دوو قوتبى دژ بەيەك.

**قاطِبَةً**: دەگـوترێ: (جـاء القـوم قاطِبَـةً) خەڵكەكە هەموويان هاتن.

**القُطْـبُ**: بەرداشـى ژێـرەوەى ئـاش ٥ (قوتبى ئاش).

**قُطْبَـا الأَرْضِ**: قـوتبى بـاكورو قـوتبى باشور ٥ هەروا وشەى (القُطبُ) نـاوە بۆ سەرە تيرو تيژاييیەكەى ٥ جۆرە ڕوەكێــكە بەسـەر زەوى دا درێـژ دەبێتـەوە ٥ گوڵێـكى زەردى هەيـەو چقڵێكى هەيە كە دروايـەوەو وشـك بــوو زۆر زەحمەتــە بتــوانرێ ڕۆيشتنى بەسەرا بكرێ.

**القُطْـبُ مـن القـوم**: ڕيـش سپىو پيـاو مـاقوڵى نەتـەوە ٥ دەگـوترێ: (فـلان قطب بني فلان).

**القُطْبَةُ**: بستەى ئاشو بناغەى ئاش.

**القطـوبُ**: كەسێـك ناوچـەوانى لێـك بنێو گرژ بێ ٥ شێر.

**القَطيبُ مـن الـشراب**: شـەرابى تێـكەڵ كراو.

**المقطوب**: بەمانا (القطيب) دێ.

**قَطَرَ الماءُ والـدَّمعُ وغيرهمـا قَطْـراً وقطرانـاً وقطوراً**: ئاوەكە يان فرمێسكەكە دڵۆپ دڵۆپ چۆڕايە خوار.

**قَطَرَ المـاءَ والـدَّمعَ وغيرهمـا مـن الـسوائل**: ئاوەكـەى دڵـۆپ دڵـۆپ داچـۆڕاند يـان فرمێسكى ڕژاند.

**قَطَرَ القطور في العين**: دڵۆپە قەترەى كردە نــاو چـاوەوە ٥ دەشـگوترێ: (قطـر الله الصمغ من الشجر) خودا قـەترە قـەترە صەمغى لە درەختەكە داچۆڕاند.

**قَطَـرَ فلانـاً**: فلآنكـەس بەتونـدى قاچـى بەزەوى دا دا.

قَطَرَهُ فرسه: ئەسپەکەی بەلایەکی دا سوارەکەی هەڵدایە خوار ◦ (ماقطرك علینا) کێ تۆی بۆ ئێمە باراند بۆ ئێمەی هێنای.

قَطَرَ الإبلَ: حوشترەکانی لێك نزیك خستنەوەو ڕیزی کردن ◦ هەروا دەگوترێ: (قطر البعیر الی غیره) حوشترەکەی خستە پەنا یەکێکی ترەوە بە جوتە لێی خوڕین.

قَطَرَ البعیرَ: حوشترەکەی بەقەتران هەنووی‌و ڕەنگی کرد.

قَطَّرَ الثوبَ: قوماشەکەی درو.

أقطَرَ النبتُ: ڕوەکە بەسەر چوو وردە وردە خەریکە وشك بێ.

أقطَرَ الماءُ وغَیرُهُ: ئاوەکە کاتی ئەوەی هاتووە قەترە قەترە داچۆڕێ ◦ دەگوترێ: (أقطرت السماءُ) ئاسمان کەم کەم بارانی باراند.

أقطَرَ الماءَ والدَّمعَ ونحوهما: دڵۆپ دڵۆپ ئاو یان فرمێسکی ڕژاندە خوار ◦ دەگوترێ: (أقطر الماءَ في الحلق) و (أقطر الدواءَ في العین).

قَطَّرَ الماءَ والدَّمعَ وغیرهما من السوائل: بەمانا (قَطَرَهُ) دێ.

قَطَّرَ السائلَ: شلەمەنییەکەی کوڵاندو بوو بەهەڵم‌و ئەمجار دڵۆپ دڵۆپ داچۆڕایەوە خوار.

قُطِّرَ اللصوصُ في المقطورة: دزو جەردەکان هەموویان بەڕیز یەکەیەکە خرانە ناو پێوەندو دەسبەندەوە بە شوێن یەك دا ڕاپێچی بەندیخانە کران.

تقاطر القومُ: خەڵکەکە ڕیز ڕیز بەشوێن یەك دا هاتن.

تقاطر الماءُ والدَّمعُ وغیرهما من السوائل: ئاوەکە یان فرمێسك زمنگۆڵ زمنگۆڵ داچۆڕا.

تقاطر کتبُ فلان: نامەو نووسراوەکانی فلان یەك بەدوایەك دا هاتن.

تَقَطَّرَ فلان: فلانکەس لەبەرزاییەوە خۆی فرێدایە خوارەوە.

تَقَطَّرَ بفلان فَرَسُهُ: ئەسپەکە فلانکەسی هەڵدایە خوار، گلاندی.

تَقَطَّرَ الرَّجُلُ عن کذا: پیاوەکە لەئەو شتە دواکەوت.

تَقَطَّرَ الرجُلُ: پیاوەکە خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕو بەحەماسەتەوە چاوەڕوانی دەست پێکردنی کرد.

إستَقطَرَ الشَّیْءَ: هەوڵی دا شتەکە دڵۆپ دڵۆپ بچۆڕێتەوە.

إستَقطَرَ فلان الخیرَ: فلانکەس وردە وردە خێرو بێری بۆ هات.

الإستقطارُ: پاڵاوتنی عونصورە سەرەکییەکانی شلەمەنی کە لەگوڵو

شتی وا دەگیرێ بەهۆی بەکارهێنانی جیهازێکی تایبەتی.

**الـتَّقطِيرُ**: بـەمانا (الإستـقطار) دێ ٥ پـالاوتنی ئـاو و پاككردنەوەیـەتی لەهـەر مادەیـەكی بێـگانەو زیانبەخش ٥ گۆڕاندنی شلەمەنیو كردنـی بەهـەڵم پاشـان سـارد كردنـەوەیو بۆئـەوی ببێتـەوە بەشـلەمەنی، ئـەمیش بـەهۆی جیهازی (تەقطیر).

**القـــاطِرةُ**: شـــەمەندەفەر ٥ هـــەر عەرەبەیەك هێزی بوخار یان وزەی كارەبا بیجوڵێنێ.

**القِطار**: قافڵەی حوشتر كەیـەك لـەدوا یـەك ڕێچكە ببەسـتن ٥ دەگـوترێ: (جـاءت الإبـلُ قِطـاراً) كاروانـە حوشترەكە ڕێچكەیان بەستو بەڕیز هـاتن ٥ كۆمەڵـە عارەبانەیـەك یـەك لەدو یەك كە قاطیرەیەك ڕایانكێشێ ٥ شەمەندەفەر.

**القِطارَةُ**: كۆمەڵە حوشترێك یەك لـەدو یەك پێكەوە ببەسترێن.

**القُطَارَةُ من الشَّيْ**: ئـەوەی لـە شـتەكە داچۆڕاوە ٥ ئـاوی كـەم ٥ دەگـوترێ: (في الإناء قُطارة من ماء).

**القَطْرُ**: باران ٥ دڵۆپە باران ٥ فرمێسك.

**القِطْرُ**: مسی تواوە ٥ ئاسنی تواوە.

**القَطَـــرُ**: ئەوەیـە كـابرا سـەبەتە خورمایـەك كێشانە بكا یان فـەردە شتێـك بكێـشێو بـاقی مانـدەی شتەكە بەو مەزەندە بكاو نەیكێشێ.

**القُطْرُ**: دەڤەرو ئیقلیم.

**قُطْرُ** الإنـسان: لای ئـادەمیزاد؛ تەنیشتی ٥ بەشێكی جەستەی.

**قُطْـرُ** الـدائرة: هێڵێـكی ڕاستەو كەوانـە دەكاتە دوویەشی وەكوو یەك.

**القَطْـرَةُ**: یـەكجار ٥ دڵۆپـە ئـاو ٥ خـاڵو نوقتـە ٥ قـەترە دەرمـانی چـاو ٥ دەشـگوترێ: (رماه الله بِقَطَـرَةٍ) خـودا بەلایەكی بۆ ناردن.

**القَطَّـارَةُ**: ئامێرێـكە دەرمـانی پـێ دەكرێتـــە دڵـــۆپ دڵـــۆپو دەچـۆڕێندرێتە نـاو شـتی تـر بەمەبەستی چارەسەرو شتی تر.

**المُقَــاطَرَةُ**: بـەمانا (القَطَـــرُ) دێ ٥ دەشگوترێ: (أكراه مُقَاطَرَةً) بـەكرێی گرت بۆچوونو هاتنەوە.

**المِقْطَــرَةُ**: تەختــەدارو چەپەرێـــكە كونكونـــە، قاچـی بەنـدكراوانی تێـدەكرێ، ئـەم جـۆرە بەنـدكردنـە ئێستا نەماوە.

**المَقْطُـــورَةُ**: عەرەبەیەكـــە قـــاتیرە ڕادەكێشێ.

**تَقَطْرَبَ الرجلُ**: پیاوەكە زۆر بـەخێرایی سەری خۆی بادا.

**القُطْرُبُ**: دزی كارامـا لـە دزیكـردن دا ٥

ڕوەکێـکی چـقڵاوییە دەنکـە تـۆمی وەکـوو گـەنمی هەیـە، هەرکەسـێ بـەلای دا بـڕوا پێـوەی دەنووسـێ ٥ مێشێکە حـەجمینی نیـە بـەکوردی پێـی دەگـوترێ: بزبزۆکـە، بەشـەو دەدرەوشێتەوە وەکوو گوڵە ئەستێرە ٥ ئەخۆشیەکە توشی مێشك دەبێو مـاخۆلان دەخاتـە نـاو جەسـتەی ئەخۆشـەکەو حـەجمینی لێ دەبـڕێ وەکـوو بزبزۆکـە هەمیـشە لـەجمو جۆڵدایە.

قَطْـرَنَ الـبعيرَ: حوشـترەکەی بەقـەتران هەنوو ڕەنگی کرد.

القَطِـرانُ: گوشـراوی درەختـی ئـەرەزو ئەبهەلـە دەکوڵێنـدرێنو پاشـان حوشترو شتی وایان پێ دەهەنوون ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ﴾ ٥ مادەیـەکی ڕەشو لیـنجو شـلەمەنییە لـە درەخـتو خـەڵوزو شـتی وا دەردەهێنـدرێ بەشـێوەی تەقطیری وشكو بەکاردەهێندرێ بۆ پاراسـتنی دار لـە مۆرانـەو ئاسـن لەژەنگ.

قَطَّ السعرُ قَطّاً وقطوطاً: نرخ بەرز بۆوە.

قَطَّ الشَّيْئَ قطّاً: شتەکەی لەپانیـدا بـڕی ٥ دەشگوترێ: (قَـطَّ القَلَـمَ) قەڵەمەکـەی دادا ٥ (قَـطَّ البيطـار حـافر الدابـة) بەپیتارەکە سمی وڵاخەکەی تاشی ڕێکی خست.

قَطَّ السِّعرَ: نرخەکەی بەرز کردەوە.

قَطَّ الشَّعرُ قططاً وقطاطةً: قژەکە کورتو گشتو گرژ بـوو ٥ دەشـگوترێ: (رجـل قَطُّ الشعر وقططه).

قَطَّط الخراطُ الحُقَّةَ: دارتاشەکە، وەستاکە قوتووەکە یـان سـندوقە بـچوکەکەی دروست کردو ئەملاو ئەولای ڕنینو ڕێکی خستن.

إقْـتَطَّ الـشَّيْئَ: شـتەکەی بڕیـەوە قرتاندی ٥ دەگوترێ: (قَطَّ فاقْتطَّ).

انْـقَطَّ الـشَّيْئَ: پانـەوپان شـتەکەی بڕییەوە.

الأقَطُّ: ئەوەی ددانی تێك شکابن بنکی ددانەکانی دەرکەوتبن.

قَطَاطِ: واتە بەسمە ٥ بەشم دەکاو لێم زیادە.

القَطَّاطُ: قەراخی کێو ٥ قـەراخی بـەرد ٥ کەرەسـەی پینەچـیو پـێڵاو دروسـتکەر ٥ قـژی زۆر گـشت ٥ قەراخی سمی وڵاخ ٥ دەوران دەوری.

القَطَـائِطُ: دەگـوترێ: (جـاءت الخيـلُ قَطائِطَ) حوشترەکان جەڵەب جەڵەب هاتن.

قَطُّ: ئەم وشـەیە بـە سـێ جـۆر بـەکاردێ: (١) زەرفی زەمان ٥ دەگـوترێ: (مافعلتُ

هذا قَطٌّ) ٥ (٢) بەمانا (حَسْبُ)بێ، بەزۆری ئەو کاتە پیتی (ف) دەخرێتە پێشەوەی ٥ دەگوترێ: (أخذت درهماً فقط) ٥ (٣) ئیسم فیعل بێ، ئەو کاتە (نون الوقاية)ی پێوە دەنرێ ٥ دەگوترێ: (قَطْنِي) بەسمە ٥ دەشگوترێ: (قَطْكَ).

**القَطُّ من الشَّعر**: قژی کورتو گرژو گشت ٥ دەگوترێ: (رجل قَطّ الشَّعرِ) پیاوێکی قژ کورتو گرژو گشتە.

**القِطُّ**: پشیلە ٥ بەش‌و بار ٥ چەکی پارە ٥ کتێبی موحاسەبە ٥ کتێب بە گشتی.

**القَطَطُ**: دەگوترێ: (شَعرٌ قَطَطٌ) قژی گرژو گشت‌و کورت ٥ (رجل قَطَطٌ) یان (هو جعد قَطَط) پیاوێکی رژدو چروکە.

**القَطَّاطُ**: بەردتاش، دارتاش واتە دەق بەمانا (الخَرّاط) دێ.

**القَطَّةُ**: قاشە شت، کەرتی شت ٥ دەگوترێ: (هات قَطَّة من البَطيخ) قاشە کاڵەکێکم بۆ بێنە.

**القِطَّةُ**: پشیلە مێینە.

**القَطيطَةُ**: بەرزایی قەراخی ئەشکەوت.

**المَقَطُّ من الفرس**: نێوان لای خواروی پەراسو و ورگ لە جەستەی ئەسپ.

**المِقَطُّ**: قەڵەم دادەر ٥ هەرشتێك نووسەر قەڵەمی پێ دابدا.

**المِقَطَّةُ**: بەمانا (المِقَطّ) دێ.

**قطعَتِ الطيرُ قُطوعاً**: باڵندەکان لە وڵاتێکەوە رەویان کرد بۆ وڵاتێکی تر.

**قطع الرجلُ بحبل قَطْعاً**: پیاوەکە بەحەبلێك خۆی خنکاند.

**قطع برأيه**: بڕیاری خۆی داو پاشگەز بوونەوەی نیە.

**قَطَعَ الشَّيْءَ قَطْعاً**: شتەکەی بڕییەوە، هەندێ پەل‌و پۆی لێ کردنەوە.

**قَطَعَ النَّخلَةَ**: بەری دارخورماکەی چنی.

**قَطَعَ الثَّمَرَ**: میوەکەی لێ کردەوە، ڕنی.

**قَطَعَ النخالةَ من الدقيق**: سۆ و شتەکەی جیاکردەوە.

**قَطَعَ الصَّديقَ**: وازی لە برادەرەکەی هێناو دەنگی لێ دابڕی.

**قَطَعَ رَحِمَه**: وازی لە خزمایەتی ئەو هێناو هاموشۆی نەکردن.

**قَطَعَ الصلاةَ**: نوێژەکەی بەتاڵ کردەوە، بەقسەی بێگانەو کرداری جودا لە کرداری نوێژ.

**قَطَعَ النهرَ**: لە ڕوبارەکە پەڕییەوە لەمبەر بۆ ئەوبەر یان بەپێچەوانەوە.

**قَطَعَ فلاناً**: بەبەڵگەی بەهێز فلانکەسی بێدەنگ کرد.

**قَطَعَ الطريقَ**: ڕێگاکەی گرت، بوو

بەچەتر، خەڵکی ترساند یان خەڵکی ڕوت کردەوە.

**قَطَعَ فلاناً عن حق فلان:** فلانکەسی مەنع کرد لەمافی فلان.

**قُطِعَتْ يَدُهُ:** دەستی بڕاو لێ بۆوە ٥ بەتیغ بڕا یان بەهۆی دەردێکەوە بڕایەوە.

**قَطُعَ: الرجلُ قطاعَةً:** پیاوەکە نەیتوانی قسە بکا.

**قُطِعَ بفلان:** فلانکەس نەیتوانی سەفەر بکا، لەسەفەرەکەی دابڕا ٥ دەگوترێ: (قُطِعَ به) لە سەفەر کردن نائومێد بوو کاتی لەمپەرو شتی وا هاتنە سەر ڕێی.

**أقْطَعَ النَّخلُ:** خورماکە وەختی ڕنینی هات، کاتی بڕینی هێشوەکانی هات.

**أقطَعَت الدُّجَاجَةُ:** مریشکەکە لە هێلکە چۆوە.

**أقطع السماءُ بموضوع كذا:** ئاسمان لەفلان شوێن بارانی نەباراند ٥ دەگوترێ: (أمطرت السماء ببلد كذا وأقطعت ببلد كذا).

**أقطَعَ القومُ:** خەڵکەکە بارانیان لێ نەباری.

**أقطع ماء البئر:** ئاوی بیرەکە ڕۆچوو.

**أقْطَعَ فلان:** فلانکەس بەڵگەی پێ نەماو بۆری خوارد.

**أقْطَعَ خَصْمَهُ بالحجة:** بەبەڵگە بەرهەڵستکارەکەی بێدەنگ کرد.

**أقطع فلاناً:** فلانکەسی لە ڕوبارەکەوە پەڕاندەوە ٥ دەشگوترێ: (أقطَعَهُ النهرَ): پەڕاندیەوە بۆ ئەوبەری ڕوبار.

**أقطَعَ فلاناً أرضاً:** زەوییەکی دابڕی بۆ فلانو کردی بەملکی ئەو ٥ دەشگوترێ: (أقْطَعَهُ أغصاناً) ڕێگای داچەند لقێکی درەختەکە ببڕێ.

**قاطَعَ فلاناً:** دەنگی لە فلانکەس دابڕی پەیوەندی خۆی لەگەڵ پچڕاند.

**قاطَعَ القومَ:** ئامادە نەبوو هاریکاری لەگەڵ خەڵکەکە بکا ٥ یاساغی کرد پەیوەندیی ئابوری یان کۆمەڵایەتیو شتی وایان لەگەڵدا ببەسرێ ٥ دەشگوترێ: (قاطع بضائعهم ومنتجاتهم) نەیهێشت کاڵاو بەروبوومیان لێ بکڕدرێ.

**قاطع الرجلان بسيفهما:** دووپیاوەکە شمشێرەکانیان بەتاقی کردەوە بزانن کامیان بڕندەترە ٥ دەشگوترێ: (قاطع فلان فلاناً بسيفهما).

**قاطع فلاناً على كذا وكذا من الأجر والعمل ونحوهما:** فلانکەسی کردە سەرپەرشتیاری فلان شوێن بە کرێیەکی دیاریکراو.

قوس قزح
مقصلة
قرميدة
قاعدة التمثال
مقشة
قطر المضلع
القطب الشمالي
قصعة
القعوان
قفة
قصبة الرئة
مقرعة
مقص
قطر المضلّع
القطب الجنوبي
قطر الدائرة
يقطينة
قرعة
قرانيا
قصب السكر
قطيفة
قرن الغزال
قرنفل
قصاص
قرطم
قطن
قطلب
قرطمان
ابن مقرض
قرمزية
قارية
قرقدان
دود القز
قصب
قعقع
قرقف
قرلّى

قَطَّعَهُ: بۆ زێدەڕۆیی لەمانای (قَطَعَ) دێ.

قَطَّعَ الخمرَ بالماء: شەرابەکەی تێکەڵ بەئاو کرد.

قَطَّعَ الفرسُ الجريَ: ئەسپەکە بەهۆی تەڕدەماخیو نیشاتیەوە بەچەند جۆرە ڕۆیشتنێك ڕۆیشت، دەگوترێ: (فرس يُقَطِّعُ الجريَ).

قَطَّعَ الجوادُ الخَيْلَ: ئەسپە ڕەسەنەکە لە پێشبڕکێدا پێش ئەسپەکانی تر کەوت.

إقتَطَعَ من الشَّيْئِ قِطعَةً: پارچەیەکی لەشتەکە کردەوە.

إقتَطَعَ من المال: بەشێکی لەماڵەکە بۆخۆی دابڕیو وەلای نا.

إنقَطَعَ الشَّيْئُ: شتەکە کاتی بەسەر چوو ٥ دەگوترێ:

إنقَطَعَ الحَرُ والبردُ: گەرما کاتی بەسەرچوو یان سەرما نەما.

إنقَطَعَ النهرُ: ڕوبارەکە وشك بوو.

إنقَطَعَ الكلامُ: قسەکە تەواو بوو قسەکەر وەستاو درێژەی پێ نەدا.

إنقَطَعَ الى فلان: کەوتە گەڵ فلانو بوو بەدۆستو هاونشینی ئەو بەتایبەتی.

أُنقُطِعَ بفلان: فلانکەس بەناچاری لەسەفەرکردن کەوتو ڕێگەی درێژەدان بەگەشتەکەی لێ گیراو کەوتەوە.

تقاطَعَ الشَّيْئُ: شتەکە هەندێکی لەهەندێکی جیابۆوە.

تقاطَعَ القومُ: خەڵکەکە هەندێکیان دەنگییان لە هەندێکیان دابڕی، دەشگوترێ: (تقاطعت أرحامهم) قەتعی سیلەی ڕەحمیان کرد لەناو خۆیان داو دەنگییان لێك دابڕی.

تَقَطَّعَ الشَّيْئُ: شتەکە لێك ترازاو پارچە پارچە بوو.

تَقَطَّعَ أمرهم بينهم: لەناو خۆیاندا لێك ترازانو پارچە پارچە بوون.

تَقَطَّعَ بهم الأسباب: داماو بوونو کاریان بۆ ئەنجام نەدراو هۆکارەکانیان لەدەست چوون ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الأَسْبَابُ﴾.

إستَقْطَعَهُ: داوای لێ کرد پارچەیەکی بۆ دابڕێ.

الأَقْطَاعُ: دەگوترێ: (ثوب أقطاع) قوماشێکە پارچە پارچە کراوە، لێکدراوە.

الإقطاعُ: یاسای دەرەبەگایەتی کە دابونەریتی ئاغایەتیو مسکێنی یان ئاغایەتیو سەپانی ٥ بەوە ئاغاو بەگ چین لەدوای چین خاوەنداریەتی زەوییان بەدەستەوە

بێ‌و بێ‌ماندوو بوون بەشێکی زۆری ڕەنجی شانی مسکێن‌و هەژار بۆ خۆیان قۆرغ بکەن.

**الإقطاعي**: ساماندارو دەرەبەگ کە بەپاسای دەرەبەگایەتی ببێتە خاوەنی زەوی.

**الأقطع**: دەست بڕاو ٥ کەڕو بێ گوێ.

**الأقطوعة**: وەرەقەی لێک جودا بوونەوە بۆ نموونە وەرەقەی تەلاقنامە کە لە مێردەوە دەنێردرێت بۆ ژن.

**التّقطيعُ**: ژانەسک ٥ سک ئێشەو پێچی ئازاری سک.

**القاطِعُ**: ئەو نموونەیە کەلەسەر شێوەی ئەو قوماش یان پێست دەبڕدرێ ٥ دەگوترێ: (قطع الأديمَ على القاطع) ٥ دەگوترێ:

**سيف قاطِعٌ**: شمشێرێکی بڕندەیە ٥ (كلام قاطِعٌ) قسەیەکی ڕەتنەکراوە ٥ (لبن قاطِعٌ) ماستێکی ترش ٥ (فلان قاطع الطريق) فلانکەس ڕێگرو چەتەیە ٥ خەڵك ڕوت دەکاتەوە.

**القِطَاعُ من الليل**: بەشێك لەشەو لەسەرەتاوە تا سێیەکی شەو ٥ بەشێکی تایبەتی‌و دابڕاو لەهەر شتێك بێ ٥ دەگوترێ: (القِطاع الصناعي) یان (القطاع الزراعي) ٥ ئەو نموونەیەی کە قوماش‌و شتی وای لەسەر شێوەی دەبڕدرێ ٥ (زمن قِطاع النّخل): کاتی گەیشتنی خورماو وەختی چنینی.

**القُطَاعَةُ**: کۆمەڵە شتێك لە شتێك دەکرێنەوە ٥ ئەو پرژو پاڵ‌و شتەی لەکاتی بڕینەوەو لێکردنەوەی شت دا هەڵدەوەرێ.

**القَطّاع من الرجال**: پیاوێك گوێ نەداتێ دۆست‌و ناشنای خۆی تورە بکاو دەنگیان لێ دابڕێ‌و لایەنی دۆستایەتی‌و خزمایەتی بەرچاو نەگرێ ٥ قەتعی سیلەی ڕەحم بکا ٥ دەشگوترێ: (سيف قاطع) شمشێرێکی بڕندەو تیژە.

**القُطْعُ**: پێچی سك هێشان، ژانە سك ٥ هەناسە سواری بەهۆی ماندوو بوونەوە یان بەهۆی قەڵەوییەوە ٥ یان بەهۆی شتی ترەوە، تەنگە نەفەسی.

**القِطْعُ من الشجرة**: لق‌و پۆپی بڕدراوی درەخت ٥ هەروا وشەی (القِطْعُ) ناوە بۆ بەشێك لەشەو ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ﴾.

**القِطْعَةُ**: بەشێك لەشت.

**القُطْعَةُ**: شوێنی بڕاویی لەشتە بڕاوەکە.

**القَطَعَةُ من الشجر:** خەڵفو نەمام كە لەشوێنی بڕاوی درەخت سەر هەڵدەدەنەوە.

**القَطُوعُ:** كەسێك دۆستایەتیو برادەرایەتی بەردەوام نەبێ ٥ پەردەو لەمپەری نێوان دوو شت.

**القَطِيعُ:** بڕدراو ٥ لقە درەختی بڕدراو (مێولاك) ئەو جۆرە دارەی سەرە تیری لێ دروست دەكرێ ٥ قامچی كە لە تیلمە چەرم دروست دەكرێ بەم جۆرە تیلمەكان تێك باهەڵدەدرێنو ئەمجار وازیان لێ دێنن تا وشك دەبنەوەو وەكوو عەصا ڕەق دەبن ٥ جەڵەبە مەڕو بزنو ڕەشەوڵاخو ئاسكو حەیوانە كێویو شتی وا ٥ هەروا وشەی (القطيع) بەمانا هاوشانو هاوو وێنە هاتووە ٥ دەگوترێ: (فلان قطيع فلان) فلان هاوشانی فلانە یان وەكوو ئەو دەچێ لەسەرو سیمادا ٥ یان دەگوترێ: (هذا الثوب قطيع هذا) ئەم قوماشە لەو قوماشە دەچێ ٥ هەناسە سوار، تەنگە نەفەس ٥ پیاوێك نەتوانی بەئاسانیو ئاسایی هەڵسێ ٥ مرۆڤێك لە قسەكردندا ناوبەناو زمانی بگیرێ ٥ یان زمان ڕەوانو قسە لوس نەبێ.

**القُطَيْعاء:** دەگوترێ: (إتّقوا القُطيعاء) خۆ لەوە بپارێزن لەشەڕدا پەرتەوازە ببنو لێك دابڕێن.

**القَطِيعَةُ:** واز لێكتر هێنانی دۆستو ناسیاو و دەنگ لێك دابڕین ٥ وازهێنان لەچاكە كردن لەگەڵ خزمو كەسو كاردا ٥ پارچە زەوییەك، دەڤەرو ناوچەیەك فەرمانڕەوا بەبێ بەرامبەر دەیبەخشێ بەیەكێك لەكاربەدەستەكانی یان بەیەكێك لەهەوادارانی ٥ (ك: قواطع).

**القَوَاطِعُ من الطيور:** ئەو پۆلە باڵندانەن كە بەسروشت وەرزانە لە دەڤەرێكەوە ڕەو دەكەن بۆ دەڤەرێكی تر، گەرمێنو كوێستان دەكەن ٥ هەشت ددانی پێشەوەی دەم (چواری سەرەوە چواری خوارەوە) كە پێیان دەڵێن كەڵبە ٥ بڕەر بڕندە.

**المُقاطَعَة:** خۆ دابڕین لە مامەڵە كردن لەگەڵ كەسانی دیكەو وڵاتی دیكە لەڕوی ئابوریو كۆمەڵایەتی بەگوێرەی یاسایەكی هەرەوەزیو سەرانسەری.

**المُقَطَّعُ من الحديد:** ئەو ئاسنەی چەكی لێ دروست دەكرێ ٥ هەروا وشەی (المُقَطَّع) ناوە بۆ پیاوی قاڵبوو و خاوەن ئەزموون ٥ ئاڵتون كە بكرێ

بەخشڵ ◦ قوماشی بڕدراو و لێك دراو و دوورواو و كراو بە پۆشاك، وەكوو كراس و دەرپێ و شتی وا ◦ پۆشاكی كورت.

**المُقَطَّعات**: جۆرە قوماشێكە گوڵ و خەتخەتی دابڕ دابڕی تێدا بن.

**مُقَطَّعات الكلام ومُقَطَّعات الشعر**: پارچەو برگەی كەلام و شیعر.

**المَقاطِعُ**: هەرشتێك دواییی ئەو شوێنە بێ كە كۆتایی دێ، وەكوو پارچە لمبەلان و پارچە شیو و دۆڵ و پارچە زەوی كشت و كاڵ ◦ لە ڕووبارو شتی وادا بەو شوێنە دەگوترێ كە لێی دەپەڕیەوە بۆ ئەو بەر (بوار).

**مَقْطَع الحق**: ئەو قسە حەق و ڕاستەی قسەی بەتاڵی پێ دەپوچێندرێتەوە ◦ برگەی شیعرو برگەی كەلام ◦ برگە بریتیە لە پیتێكی خاوەن بزوێنی (فەتحە) یان پیتی داخراو، وشەی (كَتَبَ) پێك هاتووە لە سێ برگەی خاوەن فەتحە ◦ (قَالَ) پێك هاتووە لە دوو برگە ◦ برگەی داخراو پێك هاتووە لە پیتێكی فەتحەدارو پیتێكی ساكن وەكوو (قَدْ) (بَلْ).

**المِقْطَعُ**: سەرە تیری باریك لەدار بێ یان لەشتێكی تر كاغەزی پێ دەبڕدرێ ◦ نموونەیەكە كاغەزو چەرم و شتی وای لەسەر شێوەی دەبڕدرێ ◦ پیاوێك قەتعی سیلەی ڕەحم بكا ◦ شمشێری بڕندە.

**المُقْطَعُ من الرجال**: پیاوی بێ كارو كاسبی ◦ پیاوێك لە زێدو نیشتمانی خۆی و ماڵ و خێزانی دابڕابێ ◦ بواری ڕووبار كە لەم بەر بۆ ئەوبەر لێی دەپەڕنەوە.

**المَقْطَعَةُ**: دەگوترێ: (الهجر مقطعة للود) هات و چۆ نەكردن دەبێتە هۆكار بۆ نەمانی خۆشەویستی.

**المُنْقَطِعُ**: دەگوترێ: (فلان منقطع القرين في السخاء ونحوه) فلانكەس لە بەخشندەییو شتی وادا بێ وێنەیە ◦ هەروا دەگوترێ: (فلان منقطع العِقالِ في الشر والخبث) فلانكەس هیچ شتێك لەشەڕو خراپەكاری نایگێڕێتەوە.

**قطفت الدَّابَّةُ قطافاً**: ولاخەكە بەسستی و تەمبەڵی ڕۆیی لەپەند دا هاتووە دەڵێ: (أقطف من أرنب).

**قَطَفَ الشَّيْءَ قطفاً**: شتەكەی بڕییەوە.

**قَطَفَ الثَّمَرَ**: میوەكەی چنی ◦ دەشگوترێ: (قَطَفَ رأسَهُ).

**قطف رأس الجراد**: سەری كوللەكانی لێ كردنەوە.

**قَطَفَ وَجْهَهُ**: ڕوخساری ڕوشاند.

**أَقْطَفَ الكَرْمُ**: مێوەکە وەختی بڕینی هاتووە.

**أَقطَـفَ القـومُ**: خەڵـکەکە مێوەکـەیان کاتی بڕینی هاتووە.

**قَطَّفَـهُ**: بۆ زێـدەڕۆیی لـەمانای (قَطَـفَ) دێ.

**قَطَّفَ الماءَ في الخمر**: ئاوەکەی تکاندە ناو شەرابەکەوە.

**إقتَطَفَ**: بەمانا (قَطَفَ) دێ.

**القَطَـائِفُ**: ماریلـە پارچـە هـەویری بچکۆلە لـول دەکـرێن‌و بەکەوانـەیی سور دەکرێنـەوەو نـاواخن دەکـرێن بەکاکڵـە گـوێزو شـتی وا ٥ برمـەو شـیرینی لـەو جـۆرە کـە بـەزۆری لەمانگی ڕەمەزان دا ئەنجام دەدرێ.

**القِطـاف**: بـەمانا (القِطـف) دێ ٥ کـات‌و وەرزی چنینی میوە.

**القطافة من الشجر**: هەرچی لە درەخت بچندرێ ٥ میوەمیەك لەکاتی ڕنین‌و چنینی دا بکەوێتە خوار.

**القِطْفُ**: هەرشتێك لە درەخت بچندرێ ٥ هێـشوە تـرێ‌و هێـشوە خورمـا لەکاتی لێکردنەوی دا ٥ لە حەدیس دا هاتووە دەفـەرموێ: (يجتمـع النفـر على القِطفِ فَيَشْبَهُهُمْ). (ك: قطـاف وقطوف).

**القَطَـفُ**: ئەسـەرو شـوێن دەسـت ٥ ڕوەکێـکە لـەخاکی خوێـواوی (شۆرەخاك)دا دەڕوێ‌و ئاژەڵ حـەزی لێیەتی‌و بەباشی دەیخوا گەڵای بـڕێ جـۆری دەکوڵێنـدرێ‌و دەخـورێ وەکوو سپێناخ.

**القِطفَةُ**: ڕوەکێـکی بەهارییە، چقڵەکەی وەکـوو چـقڵی گیاحەسـەکە وایـە، گەڵایەکی تەپ‌وتۆزاوی هەیە.

**القَطُوفُ من الدواب**: وڵاخێـکە خـراپ بـڕوا ڕەوتـی ناشـیرین بـێ ٥ دەشـگوترێ: (غلام قطوف) کوڕێـکی نارێك‌و پێـکە لەڕۆیشتن دا.

**القَطيفُ**: میوەی ڕنـدراو و چنـدراو.

**القطيفة**: قوماشی قەدیفە ٥ قوماشێکی پرژدارو نەرمە.

**المَقْطَفُ**: پوش‌و بەرچنەیەکی بچکۆلەیە لە پـڕژی دارخورما دروست دەکرێ‌و میوەی تێدا دەچنـدرێ، یان نـاوە بـۆ ئـەو گڵێنـەو بنکـە کوپانـەی گـڵ‌و سـەمادیان تێـدەکرێ‌و درەخـت‌و ڕوەکیان تێدا دەڕوێندرێ.

**المِقْطَـفُ**: داس‌و چـەقۆ و کێـردی میـوە لێـکردنەوە ٥ لاسـکی هێـشوە تـرێ‌و هێشوە خورما.

**تَطْقَطَـتِ الـسماءُ**: ئاسمـان بـارانی بەردەوامی باراند.

**تَطْقَطَتِ القَطـاةُ والحجلـة**: قەتێـکە، یـان

کەوەکە خوێندی فرتە فرتی کرد ٥ (فهي مُقَطْقِطة).

**تَقَطْقَطَ الرجلُ**: پیاوەکە سواری سەری خۆی بوو هەر بەقسەو ڕاو و بۆچوونی خۆی کرد.

**تَقَطْقَطَ فلان في البلاد**: فلانکەس بەولآت دا ڕۆیی.

**تَقَطْقَط الدَّلو الى البئر**: دۆڵچە بە بیرەکەدا شۆڕ بۆوە.

**القَطْقاط**: ڕۆیشتنی خێرا.

**القِطْقِطُ**: بارانی بەردەوام ٥ وردە تەرزە.

**المُقَطْقطُ**: سەری بچوکی درێژکۆلە.

**قَطَلَهُ**: بڕی ٥ لێی کردەوە ٥ (فهو مقطول).

**تَقَطَّلَ الجِذعُ**: لقەدارەکە لە بن ڕا بڕایەوە، لێ بۆوە.

**القَطِيلَةُ**: پارچە پەڕۆو پارچە ئیسفنجێکە دڵۆپە ئاوی سفرەو کاشیو مێزی پێ وشك دەکرێتەوە.

**المِقطَلَةُ**: ئاسنێکە یان ساتوڵو کێردۆکێکە شتی پێ دەبڕدرێ.

**قَطَمَهُ قَطْماً**: گەستی ٥ بڕی ٥ کرتاندی ٥ دەگوترێ: (قَطَمَ الشَّيْءَ بأطراف أسنانه): (قطم الفصيلُ النَّبْتَ) بە بێچوە کارژیلەکە، یان بەرخۆلەکە چڵەگیایەکەی بەدەمی کرتاند.

**قَطِمَ قَطَماً**: حەزی لە گۆشت کرد ٥ دەگوترێ: (قَطِمَ الصقرُ الى اللحم) هەڵۆکە حەزی لە گۆشت کرد.

**القَطَامُ**: هەڵۆ، باز.

**القَطَامِيّ**: بازو هەڵۆ ٥ کەسێك خودبەسەری کاربکاو پرسو ڕا بەکەس نەکا ٥ شەرابێك زۆر تیژو ناخۆش بێ.

**القُطَامَةُ**: ئەوەی لەشت دەبڕدرێو فڕێ دەدرێو کەڵکی نیە.

**القَطِيمَةُ**: گوێچکە نانو شتی وا ٥ لوێچە گەنمێك ٥ شیرو ماستی بزڕکاو.

**المِقْطَمُ**: چنگو نینۆکی بازو هەڵۆ ٥ دەگوترێ: (أنشب فيه البازي مِقَطَمَهُ).

**المُقَطَّمُ**: کێوێکە لەخۆرهەڵاتی شاری قاهیرەی ولاتی میصرە.

**القِطميُّ**: ئەو توێکڵە تەنکەی بەسەر ناوکە خورماوەیەو تێوەی پێچراوە ٥ شتی زۆر بێ نرخو بێ کەڵك ٥ دەگوترێ: (ما أصبْتُ منه قِطميراً).

**قَطَنَ في المكان وبه قطوناً**: لە شوێنەکە مایەوە.

**قَطَنَ الرَّجُلَ**: فێڵی لە پیاوەکە کرد.

**قَطِنَ ظَهْرُهُ قَطَناً**: پشتی چۆمایەوە ٥ (فهو أقطن).

**قَطَّنَ الكَرْمُ**: دارمێوەکە پۆخی کرد،

پۆخەکانی دەرکەوتن.

**القَطّانُ**: کەسێك بازرگانی لۆکە بکا.

**القُطْنُ**: ڕوەکی پەمۆ ٥ لۆکە.

**القَطَـنُ**: بناغـەی کلکـی باڵنـدە ٥ لای خواروی پشت بەلای سمتەوە.

**قَطَنُ النـار**: ئـەوەی بەرپرسیاری ئاگری ئاتەشـکەدەی ئاگرپەرسـتانو هەڵگیرسێنەری ئاگرەکەیە.

**القِطْنَـةُ**: شتێـکە وەکـوو هـەنار وایـە بەسەر گەدەی ئاژەڵی سمدارەوەیە.

**القُطْنِيَّةُ**: بەرەکێشت، ئـەوەی لـە ماڵـدا هەڵدەگیرێ بۆ چێشت لێنـان وەکـوو نیسكو نۆكو شتی وا.

**القَطِينُ**: (قطين الـدار) دانیـشتووی نـاو خـانو ٥ (قطـين الله) دانیـشتوی حەرەمی مەککە ٥ دەستو پێوەنـدو خزمەتکار.

**القِيطانُ**: قەیتان، چنراوێکە لەمادەی ئاوریـشمو شتی وا قۆنـدەرەو شـتی وای پێ شەتەك دەدرێ.

**القَيْطومُ**: ژووری بچوك لەماڵدا بۆ تێدا حەوانەوەی ئافرەتو منداڵ لەکاتی هاتنی میوانی بێگانەدا.

**المَقْطَنَـةُ**: کـشتوکاڵی پـەمۆ ٥ زەوی کشتوکاڵی پەمۆ.

**الـيَقْطينُ**: هـەر ڕوەکێـك قـەدی نـەبێ وەکـوو ڕوەکـی کولەکـەو تـرۆزیو خـەیار ٥ بـەزۆری بـۆ کولەکـە بەکاردێ.

**قطا قَطْواً**: بەتەمبەڵی ڕۆیشت، هـەنگاوی هێدی هێدی هەڵێنان.

**قطت القطاة**: قەتێیەکە خوێندی.

**تَقَطّى**: تەمبەڵی کرد.

**تَقَطّى لأصحابه**: فێڵی لـە هاوەڵەکانی کرد.

**تَقَطّى بوجهه عنه**: ڕوی وەرگێڕا.

**تَقَطّى الفرسَ**: سواری کەفەڵی ئەسپەکە بوو.

**القَطى**: نەخۆشییەکە توشی مەڕو بزن دەبێ.

**القطاة**: کورکی، قەتێ ٥ جۆرە کۆترێکە حەزی لە ژیانی چۆڵەوانییە هێلانە لـە زەویـدا دروست دەکا ٥ کۆمـەڵ کۆمـەڵ دەفـڕنو مەسـافاتی زۆر دوورو درێـژ دەبـڕن ٥ هێلکـەکانی پەڵەپەڵـەو بەڵەکـە ٥ (ك: قَطـاً: وقطوات، وقطيات) ٥ هەروا نـاوە بـۆ شوێنی سـواربوونی پاشکۆی سـوار، واتە سەرکەفەڵی وڵاخ.

**القَطَـوان**: هەرکەسێـكو هەرشتێـك بەهێواشـی هـەنگاو هـەڵبێنێو هەنگاوی نزیك نزیك بهاوێ.

**القَطَـوْطىَ**: پیـاوی کورتـە بـاڵا: کـە هەنگاوی کورت کورت بهاوێ.

**القَعْبُ**: قاپێکی گەورەیە لە گەنو سەعەند ٥ (ك: قِعاب وأقْعُب).

**القُعْبَةُ**: کونەبەردو چاڵاو لە شاخو بەردا.

**القَعيبُ**: ژمارەی زۆر.

**قَعْبَلَ**: وا ڕۆیشت وەکوو ئەوە بەقاچی زەوی هەڵبکۆڵێ واتە: بەڕۆیشتن پێکۆڵی کرد.

**القَعْبَلُ**: لەگەنو سەعەندو سەتڵ کە شیری تێدا بدۆشرێ.

**القِعْبَلُ**: بەمانا (القَعْبَلُ) دێ.

**المُقَعْبَلُ**: دەگوترێ: (رجل مُقَعْبَلُ القدمين) پیاوێك پێشەوەی قاچی لێك نزیك بوونەوەو پاژنەکەیان لێك دوور کەوتنەوە.

**قَعَثَ له من الشَّيْئِ قَعْثاً وقَعْثَةً**: شتێکی کەمی پێدا.

**قَعَثَ الشَّيْئَ قَعْثاً**: شتەکەی لەبێخ دەرهێنا ٥ کۆنترۆڵی کرد.

**أقْعَثَ له في ماله**: لە ماڵ خەرج کردندا زێدەڕۆیی کرد.

**أقْعَثَ في العطية**: یان (أقْعَثَ له في العطية) بەخششی باشی پێدا.

**إنْقَعَثَ الشَّجرُ ونحوه**: درەختەکە لە بن ڕا هەڵکەندرا.

**إنْقَعَثَ البناءُ**: باڵەخانەکە لە بناغەکەیەوە ڕوخا.

**القُعَاثُ**: نەخۆشییەکە توشی لوتی مەڕو بزن دەبێ.

**القَعيثُ**: لافاو، یان بارانی بەخوڕەو قەترە گەورە.

**قَعَدَ قُعُوداً**: دانیشت (لەحاڵەتی ڕاوەستانەوە دانیشت).

**قَعَدَت الفسيلة**: نەمامەکە ڕەگەی کردو خۆی گرت.

**قَعَدَ بفلان**: هاوکوفی فلانکەس بوو.

**تقَعَدَ عن الأمر**: لەکارەکە دواکەوت، وازی لەکارەکە هێنا.

**قَعَدَت المرأةُ عن الحيضِ والولد**: ئافرەتەکە لەعادەی مانگانەو منداڵبوون وەستایەوە

**قَعَدَت النخلةُ**: دارخوماکە ساڵە ناساڵێك بەری گرت.

**قَعِدَ البعيرُ ونحوه**: حوشترەکە شلییەك بەزەنگیەوە بوو باریکایی دەستو قاچی نێوان سمو باریکایی قاچی شل بوو.

**أقْعَدَ بالمكان**: لە شوێنەکە جێگیر بوو.

**أقْعِدَ فلان**: فلانکەس جەستەی تووشی نەخۆشییەك بووە لەجێگای خست.

**أقْعَدَ الهَرَمُ فلاناً**: پیری فلانکەسی لە ڕۆیشتن خست.

**أقْعَدَ فلاناً آباؤه**: باوكو باپیری فلانکەس خوێڕیو هیچو پوچ

بوون‌و نه‌بوونه جێگای شانازی بۆ ئه‌و.
أقعد فلاناً أباهُ: فلانكه‌س كیفایه‌تی باوكی دا بۆ پێداویستی بژێو.
قاعَدَهُ: له‌گه‌ڵ فلانكه‌س دانیشت‌و هاونشینی بوو.
قَعَّدَه عن كذا: له‌و شته مه‌نعی كرد.
قَعَّدَ أباهُ: باوك‌و باپیری خۆی شه‌رمه‌زار كردن.
إقْتَعَدَ الدَّابَّةَ ونحوها: وڵاخه‌كه‌ی ئاماده‌كرد بۆ سواری.
إقْتَعَدَ فلاناً عن كذا: فلانكه‌سی له‌و شته مه‌نع كرد.
تقاعد عن الأمر: گرنگی به‌كاره‌كه نه‌دا.
تقاعَدَ الموظفُ: مووچه‌خۆره‌كه خانه‌نشین كرا.
تَقَعَّدَهُ: له‌كاره‌كه‌ی مه‌نعی كردو كۆسپ‌و له‌مپه‌ری بۆ دانا.
تَقَعَّدَ عن الأمر: گرنگی به‌كاره‌كه نه‌دا.
الإقعادُ: ده‌ردێكه تووشی هه‌ركه‌سێك بێ گۆج‌و ئیفلیجی ده‌كا.
القاعِدُ عن الأمر: كه‌سێك گرنگی به شت نه‌دا یان ته‌مبه‌ڵی بكا له جێبه‌جێ كردنی كاردا ٥ ئافره‌تێك له منداڵبوون وه‌ستابێته‌وه یان له‌عاده‌ی مانگانه‌ی ٥ یان له‌ته‌مه‌نی شوكردن تێپه‌ڕی كردبێ ٥ قورئان ده‌فه‌رموێ: ﴿وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ﴾ ٥ هه‌روا وشه‌ی (القاعد) به‌جه‌واڵ‌و هۆڕو خه‌رار ده‌گوترێ: كه پڕبێ له‌دانه‌وێڵه.
القاعدة من البناء: بناغه‌و كانگه‌ی خانو ٥ قاعیده‌و یاساو دیارده‌یه‌كی گشتی كه هه‌موو فه‌رده‌كانی خۆی بگرێته‌وه ٥ ده‌گوترێ: (كل أذون ولود).
القُعَادُ: ده‌ردێكه ئاده‌میزاد له جم‌وجۆڵ ده‌خا ٥ نه‌خۆشییه‌كه توشی كلۆتی حوشتر ده‌بێ.
القَعَدُ والقَعَدَةُ: ئه‌و كه‌سانه‌ی خۆیان له‌شه‌ڕ ده‌دزنه‌وه‌و به‌شداری شه‌ڕی به‌رگری له وڵات ناكه‌ن ٥ پێڕێك له خه‌واریج ئه‌م ناوه‌یان لێ نراوه.
القِعْدَةُ: ئه‌و شوێنه‌ی ئاده‌میزاد له‌كاتی دانیشتن دا جه‌سته‌ی ڕێی ده‌كه‌وێ ٥ شێوه دانیشتن ٥ ده‌شگوترێ:
بئر قِعْدَةٌ: بیرێكه قوڵیه‌كه‌ی به‌ئه‌ندازه‌ی به‌رزی مرۆڤێكی دانیشتو بێ ٥
(ذو القَعِدَة) مانگی یانزه‌هه‌می مانگی قه‌مه‌رییه.
القُعْدَةُ: ئه‌و شته‌ی زۆر دانیشتنی له‌سه‌ر ده‌كرێ، وه‌كوو سه‌رزین‌و

کورسی‌و شتی وا ٥ یان مینەکی شوان واتە: ئەو گوێدرێژەی شوان کەل‌وپەلی خۆی لێ دەپێچێ‌و سواریشی دەبێ ٥ یان ئەو ولاغەی دەکرێتە مینەك‌و قەتارچی بەکاری دەهێنێ بۆ سواربوونی خۆی.

**القُعَدَةُ**: کەسێك زۆر دابنیشێ.

**القُعْدِيُّ**: کەسێك زۆر دابنیشێ ٥ کەسێك پەککەوتە بێ نەتوانێ جم‌و جۆڵ بکا.

**القَعَدِيُّ**: کەسێك بڕوای بە بیرو بۆچونی (قەعەدییە خەواریجەکان) بێ.

**القُعُودُ**: منداڵ تا تەمەنی شەش ساڵانەی.

**القَعِيدُ**: هاونشین ٥ چاودێر ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ ٥ باوك ٥ کوللە کە هێشتا باڵی نەگرتبێ.

**قعيد النسب**: کەسێکە باوك‌و باپیری لە باپیرە گەورەیان نزیك بن زۆر دوور نەکەوتبنەوە.

**القعيدة**: ئافرەت ٥ پارچە عەبایەك، دۆشەکەڵەیەك لەسەری دابنیشی ٥ خەرارو گوێنی کە کەشکە وشکەو شتی وای تێدا بێ ٥ (ك: قعائد).

**المَقْعَدُ**: دانیشتن ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿فَرِحَ الْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسُولِ اللَّهِ﴾ ٥ دۆشەکەڵەو شتی وا کە لەسەری دابنیشی ٥ شتێك زۆر لێت نزیك بێ ٥ دەگوترێ: (هو مني مقعد القابلة ومقعد الخاتن) ئەو ئەوەندە لەمن نزیك بوو بەئەندازەی مامان لەژنێك کە خەریکی منداڵبوون بێ یان بەئەندازەی کێربڕ لەو منداڵەی کە خەتەنەی دەکا.

**المُقْعَدُ**: لەپەل‌وپۆ کەوتوو جم‌و جۆڵ لێ بڕاو ٥ ئیفلیج‌و پەککەوتە ٥ شەل‌و سەقەت ٥ مەمك قیت: کە شۆڕ نەبنەوە ٥ هەڵۆ داوی بۆ بندرێتەوە بۆئەوەی بگیرێ‌و پەڕو باڵی لێ بکرێنەوە ٥ شیعرێك زیحافی عەروزی تێدا بێ ٥ (مُقعَد الحسب) کەسێك بنەماڵەی خانەدان نەبێ

**المُقْعَدَةُ**: خوێڕی‌و پڕوپوچ بێچوە قەتێ پێش ئەوەی بتوانێ هەڵفڕێ ٥ بۆق.

**القُعْدُدُ**: ترسنۆك ٥ پیاوێك هەوڵی پیاوەتی نەدا.

**قَعَرَت الشاةُ**: مەڕەکە بەری هاویشت.

**قَعَرَ البِئرَ**: گەیشتە قولایی بیرەکە.

**قَعَرَ الشجرةَ ونحوها**: درەختەکەی هەڵکەند لەبێخ.

**قَعَرَ الإناءَ**: هەرچی لە قاپەکەدا بوو خواردیەوە ٥ قاپە شلەمەنییەکەی

هەڵقوراند تا چۆری لێ بڕی.

قَعَرَت البئرُ: بیرەکە قوڵ بوو بنکی بیرەکە دوور بوو.

قَعَّرَ: لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی کارە نهێنیو نەزانـدراوەکانی کـرد تـا رونـی کردنـەوە ٥ لـە قـولایی قورگیەوە قسەی کرد.

قَعَّرَ الشَّيْءَ: شتەکەی قوڵ کرد.

إنقَعَرَ: لـە ڕیـشەوە هەڵـکەندرا، ڕیشەکێش کرا.

إنقَعَرَ الرجلُ عن مالٍ له: پیاوەکە مرد.

تَقَعَّرَ: هەڵگەڕایەوە، وەرگەڕا.

تَقَعَّرَ في كلامه: لە قولایی قورگیەوە قسەی کرد ٥ زۆر قوڵبۆوە.

القَعْرُ من كل شيءٍ أجوف: کۆتـایی قولایی شتە بۆشەکە ٥ دەشکوترێ: (جَلَسَ في قعر بيته) لەناو ماڵی خۆی دانیشتو نەچوە دەر.

قَعْرُ الفم: ناو دەم.

القَعْرانُ: (إناءَ قعران) قاپو سوراحی قوڵ

القَعِرَةُ: (قَصْعَةٌ قَعِرَةٌ) لەگەنێـکە ئەوەنـدەی شـت تێدایـە بنکەکـەی شاردۆتەوە.

القَعْرَةُ: ئەو شتەی بنکی لەگەنەکەی داپۆشیبێ.

القُعْرَةُ: چالایی ٥ چاڵو چوێڵ.

القَعُورُ: شتێـك زۆر قوڵ بێ، بنکی قوڵ بێ.

القَعِيرُ: بەمانا (القَعُورُ) دێ.

المِقْعارُ: ئـەو کەسـەی دەنگـی لـەبنکی قورگیەوە بێنێتـە دەر (قَدَح مقعار) پیاڵەیەکی قوڵە.

قَعَسَ الشَّيْءُ قَعْساً: شتەکە دواکەوت ٥ گەڕایەوە بۆ دواوە.

قَعَسَ الشَّيْءَ: شتەکەی نوشتاندەوە.

قَعِسَ قَعَساً: سنگی دەرپەڕیو پشتی قوڵ بوو.

قَعِسَ الفَرَسُ: ئەسپەکە شـوێنی سواربوونیو سەرپشتی نزمو ئارامە.

قَعِسَ فلان: فلانکەس داکۆکی کرد مانیع بوو ٥ (فهو أقْعَسُ وهي قعساء).

تقاعَسَ: سنگی دەرپەڕاند.

تقاعَسَ عن الأمر: لەکارەکە دواکەوت.

تقاعَسَ الفَرَسُ: ئەسپەکە ژێربار نەبوو، بـە ویـستی سـوارەکە هەوسـارو ڕیشمەی خۆش نەبوو.

تقعَّسَتِ الدَّابَّةُ: ولاخەکە لە شوێنی خۆی وەستاو نەڕۆیی.

إقْعَنْسَسَ: بەسروشت سنگ دەرپەڕیوو پـشتی قـوڵ بـوو ٥ دواکـەوتو گەڕایەوە بۆ دواوە.

إقْعَنْسَسَ الفَرَسُ: بەمانا (تقاعَسَ) دێ.

القُعَاسُ: خـواریو گرێیەکە لە مل دا

بەرەو دواوەی دەسوڕێنێ.

**القَعْسُ**: گڵی گوراوی بۆگەن.

**القَعْساءُ**: دەگوترێ: (عزة قعساء) عیزەتو شکۆمەندیەکی سابتو بەردەوامە.

**قَعْسَرَ**: ڕەق بوو، توند بوو.

**قَعْسَرَ عليه**: بەسەریدا بەهێزو بالادەست بوو.

**قَعْسَرَ الشَّيْئَ**: شتەکەی بەتوندی گرت.

**القَعْسَرُ**: کاڵەك لەسەرتای دەرکەوتنو خرپهەڵدانی دا ٥ حوشتری گەورە.

**القَعْسَرِيُّ**: حوشتری گەورەو بەهێز ٥ شتی کۆن ٥ دەگوترێ: (عِزٌّ قَعْسري).

**قَعَشَ البناءَ وغيره قَعْشاً**: بیناکەی ڕوخاند.

**قَعَشَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کۆکردەوە.

**قَعَشَ العُودَ**: شۆڕکەکەی چەماندەوە.

**القَعْشُ**: شتێکە وەکوو کەژاوەی ئافرەت.

**قَعَصَهُ قَعْصاً**: خێرا بەڕمب زەبری لێ دا ٥ لە شوێنی کوژراوەکە کوشتییەوە.

**قَعِصَتِ الدَّابَّةُ**: ولاخەکە تووشی نەخۆشی سینگ بوو ٥ دەشگوترێ: (قَعِصَ الرجلُ) پیاوەکە تووشی سینگ ئێشە بوو.

**قَعِصَتِ الشاةُ قَعَصاً**: ئاژەڵەکە لەقەی لە مەڕدۆشەکە داو نەیهێشت بیدۆشێ ٥ (فهي قعوص).

**قاعَصَهُ**: بەزۆر خستیە ژێر دەستی خۆیەوە.

**القُعاصُ**: دەردێکە توشی سینگ دەبێ.

**قَعْضَبَهُ**: لەبێخ دەری هێنا.

**القَعْضَبُ**: کەتەو بەتواناو ئازا.

**القَعْضَمُ**: لاوازو زەعیف ٥ پیری فۆڕ.

**قَعَطَ الشَّيْئُ قَعْطاً**: شتەکە وشك بوو.

**قَعَطَ فلان**: فلانکەس ترسا ٥ بە توندی قیراندیو هاواری کرد.

**قَعَطَ على غريمِهُ**: تەنگی بە قەرزدارەکە هەڵچنیو بەسەریدا نەڕاندو داوای لێ کرد قەرزەکەی بداتەوە.

**قَعَطَ الشَّيْئَ**: شتەکەی کەشف کرد ٥ زەبتی کرد ٥ شەتەکی دا ٥ توند بەستی.

**قَعَطَ فلاناً**: فلانکەسی تڕۆکرد.

**قَعَطَ الدَّابَّةَ**: ولاخەکەی بەتوندی ڕەتاند، لێی خوڕی.

**قَعِطَ قَعِطاً**: زەلیلو ڕیسوا بوو.

**اقْعَطَ فلان**: فلانکەس بەهەموو هێزی نەڕاندی هاواری کرد.

**اقْعَطَ القومُ عنه**: خەڵکەکە دەرکەوتن، لەو شوێنە نەمان.

**اقْعَطَ في القول**: قسەی ناشیرینوبێجای کرد.

**اقْعَطَ في أثره**: لە دواوەی توندو تیژی کرد.

أقْعَطَ فلاناً: فلانكەسی زەلیل‌و ڕیسوا کرد.

قَعُطَ في القول: دەم پیس‌و قسە تڕن بوو.

قَعَطَ على غريمه: تەنگی بەقەرزدارەکەی هەڵچنی‌و زۆری ئیلحاح لێ کرد قەرزەکەی بداتەوە.

قَعَطَ الدابَّةَ: بەگوڕو توندو تیژی وڵاخەکەی لێ خوڕی.

تَقَعَّطَ: لوتبەرزی نواندو توندو تیژی ئەنجام دا.

المِقْعَطُ: ئەو پارچە قوماشەی سەری پێ دەبەستی.

قَعَّهُ قَعّاً: بەقسە سەرکۆنەی کردو بۆڕی دا.

أقَعَّ القومُ: خەڵکەکە زەویان هەڵکۆڵی‌و بەدو ئاودا گەڕان‌و گەیشتنە ئاوێکی زۆر سوێر.

القُعَاعُ: ئاوێکە زۆر سوێر: کە لەوە سوێرتر نەبێ‌و ناوسکی حوشتر دەسوتێنێ.

القُعُّ: بەمانا (القُعَاعُ) دێ.

قَعَفَهُ قَعْفاً: لەبێخ دەری هێنا ٥ ڕیشە کێشی کرد.

قَعَفَ المطرُ الحجارةَ: بارانە بەلێزمەکە بەردەکانی ڕادان.

قَعَفَ ماني الإناءَ: هەرچی لە قاپەکەدا بوو هەڵی لووشی.

قَعَفَ الدابَّةَ الترابَ: وڵاخەکە بەهۆی پێکۆڵ‌و توند ڕاپەڕینی گڵی ژێر پێی ڕادا.

قُعِفَ قَعَفاً: کەوتە خوار.

إقتَعَفَ الشَّيْئُ: شتەکە لە بێخ هەڵکەندراو ڕوخا ٥ دەگوترێ: (إقْتَعَفَ البِناءُ) خانوەکە لە بناغەوە ڕوخاو هارەی کرد ٥ (إقْتَعَفَ الجرف) کەندەڵانەکە ڕوخا.

إقتَعَفَ المطرُ الحِجارةَ: بارانە بەلێزمەو خوڕەمەکە بەردەکانی ڕادان.

إقْتَعَفَ الشَّيْئَ: شتەکەی بەتاسوخ‌و حەماسەوە هەڵگرت.

القُعافُ: (سيل قُعاف) لافاوێکی ڕادەرو ڕامالەرە هەموو شتێك ڕاپێچ دەکا.

قَعْفَزَ في المشي: لە ڕۆیشتن دا هەنگاوی کورتی هەڵێنان.

قَعْفَزَ له الكلامَ: ویستی بەهەڕەشە قسەکە لەسەر خۆی لابەرێ.

تَقَعْفَزَ: نسکۆی برد، سەرەنگرێ بوو.

إقْعَنْفَزَ: بەشێوە دانیشتنێك دانیشت کە ئامادەی بازدان‌و ڕاپەڕین بێ.

قَعْقَعَ الشَّيْئُ: شتەکە لەکاتی تێك وەردان‌و جم‌و جوڵدا دەنگی لێ هات ٥ دەگوترێ: (قَعْقَعَ السلاحُ) چەکەکە خرم‌و هوڕیان هات ٥

دەگـوترێ: (قَعْقَعَــت عُمُــدُ القــوم) کۆڵەکـە ڕەشمـاڵی خێڵەکـە کەوتنـە تەق‌و هوڕو بارکردنی خێڵ دەسـتی پێ کرد.

**قَعْقَعَ في الأرض:** بەزەوی دا ڕۆیشت.

**قَعْقَعَ الـشَّيْءَ اليـابِسَ وقَعْقَـعَ بـە:** شتە وشکەکەی تێـك وەرداو خڕو هوڕی لێ هێنا.

**قَعْقَعَ القِـداحَ:** پیاڵە شـەرابەکانی لێـك دان‌و خڕو هوڕیان هات.

**تَقَعْقَـعَ الـشَّيْءُ:** بـەمانا (قَعْقَـعَ) دێ ٥ شـتەکە کەوتـە جم‌و جۆڵ‌و خـڕو هوڕو هاتوچۆ.

**تَقَعْقَعَ بهـم الزمـان:** ڕۆژگارەکـەیان بـێ خێرو بێر بوو.

**القُعَاقِعُ:** دەنگە دەنگی زۆر گرم‌و هوڕو تەقەو ڕەقەی زۆر.

**القَعْقَــاعُ:** کەسێــك لــە ڕۆیــشتن دا جومزگەو مەفاصیلی قاچی دەنگیان لێ بـێ ٥ خـرم‌و هـوڕی چـەك ٥ لەرزوتایــەك نەخۆشــەکە بخاتــە حاڵەتی چۆقەچۆقەوەو شەقەشەقی ددانی بێ ٥ خورمای وشك ٥ ڕێـگای ناخۆش‌و هەڵدێر.

**القُعْقُـعُ:** بــەمانا (القَعْقَـــعُ) دێ کــە باڵندەیــەکی کلــك درێــژو دەنــوك درێــزە، عــەرەب بــە نیــشانەی نەگبـەتی دەزانــن ٥ (جۆرێــکە لــە قەلەڕەشکە).

**القَعْقَعَـةُ:** خـرم‌و هـوڕی چـەکە ٥ قـرە قـڕی قەلەڕەشـکە ٥ گـرم‌و هـوڕی هەور بەتوندی‌و لێکدان لێکدان.

**قَعَمَ السِنوّر قَعْماً:** پشیلەکە میواندی.

**قَعِـمَ قَعَمـاً:** تـاعون‌و پـەتای تـوش بـوو یەکسەر مرد.

**قَعِمَ الأنفُ:** لوتی خوار بوو ٥ دەشگوترێ: (قَعِمَ فَمُهُ) دەمی خـوار بـوو (فهـو أقْعَـمُ وهي قعماء).

**القَعْمَــةُ:** (قعمــة المــال) مــاڵی چـاك‌و ناوازەو بەنرخ‌و ڕەسەن.

**قَعِنَ الأنفُ قَعَناً:** لـوتی زۆر کورت بـوو ٥ (فهو أقْعَنُ).

**القَعْنُ:** تەشتی هەویر شێلان (قاپێـکی گەورەیە هەویری تێدا دەشێلدرێ).

**قَعْنَبَ الأنفُ:** لوتەکە خوار بوو.

**إقْعَنْبى الرجلُ:** پیاوەکە هەردوو دەستی لەســەر زەوی دانــان‌و سمتـی بــەرز کردنەوەو ویستی هەڵبستێتە حەوا.

**القَعْنَبُ:** لوتی خوارو خێچ.

**قَعِيَ قَعـاً:** نەرمـەی لـوتی بـەرز بۆتـەوەو سوڕاوە بۆلای نێسقانەکەی ٥ (فهو أقعي وهي قَعْواء).

**أقْعى في جلوسه:** لـە دانیـشتن دا سمتـی لەســەر زەوی دانــان‌و ڕان‌و قاچــی بەرز کردنەوە.

**أقعَى الكلبُ:** سەگەکە هەڵتروشکا، سمتی خستە سەر زەویو هەردوو دەستی ڕاست کردنەوە.

**أقعى الأنفُ:** نەرمە لوتی بەرز بۆتەوەو ئەمجار سوڕاوە بۆلای ئێسقانی.

**أقعى فَرَسَهُ:** ئەسپەکەی پاشەو پاش گێڕایەوە.

**القَعْوُ:** بەکرەی دار.

**القَعوانُ:** دوو پارچە ئاسن یان دوو پارچە دارن میحوەرێکیان لە نێوانداینەو بەکرەیەکیان لەنێوان دێوو دەچێ.

**القَعْواء:** سمت پوچ یان قاچ باریك.

**قَعْوَلَ:** واڕۆیشت وەکوو ئەوە بەقاچەکانی گڵ هەڵبگرێ هەرکە قاچی هەڵدێنێتەوە بەسنگی پێی گڵ هەڵدەدا.

**قَفِئَتِ الأرضَ قَفْئاً:** زەوییەکە گیاو گژو ڕوەکی داوەشاو تێکچو، باران و گڵو خۆڵبارین گیاو گژەکەی داوەشاند.

**قَفحَ عن الشَّيْءِ قَفحاً:** بێزی لەشتەکە بۆوە.

**قَفَفَ الشَّيْءَ:** بەقێزو بێزەوە شتەکەی قوت دا ٥ وەکوو چۆن دەرمان بەنابەدڵی دەخورێ.

**قَفَدَ لفلان قَفْداً:** ئیشی بۆ فلانکەس کرد.

**قَفَدَ فلاناً:** شەپلاخەی لە پشتەملی فلانکەس دا.

**قَفِدَ كل ذي عُنُقٍ قَفَداً:** ملی شل بوو یان ملی ئەستوور بوو.

**قَفِدَ الرجلُ:** پیاوەکە زەعیف بوو جومزگەکانی شل بوون ٥ لەسەر سەرەپەنجەکانی ڕۆیشتو پاژنە پێیەکانی لەزەوی نەکەوتن ٥ (فهو أقفد وهي قفداء).

**قَفَرَ الأثرَ قَفراً:** شوێنی ئەسەرو دیاردەکە کەوت.

**قَفِرَ المالُ قَفراً:** ماڵو سامانەکە کەم بوو.

**قَفِرَتِ المرأةُ:** ئافرەتەکە گۆشتی کەم بوو.

**قَفِرَ الرأسُ:** سەر قژی کەم بوو، توکی کەم پێوە بوو.

**قَفِرَ الطعامُ:** خواردنەکە بێ پێخۆر بوو.

**أقفَرَ الرجلُ:** پیاوەکە کەوتە چۆڵەوانی ٥ نانی بێ پێخۆری خوارد ٥ برسی بوو ٥ لە خزمو کەسوکاری دابڕا.

**أقفَرَ الطعامُ:** خواردنەکە بێ پێخۆر بوو.

**أقفَرَ المكان:** شوێنەکە کەسی تێدا نەما چۆڵ بوو.

**أقفَرَ الرأسُ:** سەر توکی پێوە نەما بێقژ بوو.

**أقفَرَ فلانٌ البَلَدَ:** فلانکەس وڵاتەکەی بەچۆڵی بینی.

**إقْتَفرَ الأثَرَ:** بەمانا (قَفرَهُ) دێ.

**تَقَفَّرَ الأثَرَ:** بەمانا (قَفرَهُ) دێ.

**القَفَـارُ:** بـەمانا (القَفـرُ) دێ ٥ نـانی بـێ پێخۆر.

**القَفْرُ:** زەوی بێ ئاو و لەوەڕو درەختو ڕوەكو چۆڵەوانی، خاڵی لـە مـرۆڤو حـەیوانات ٥ دەگـوترێ: (نزلنـا بـبني فلان فبتنا القفـر) چووینە لای خێڵی فلاَن، میوانداریان نەكردین لەساراو چـۆڵ شـەومان بـەرۆژ كـردەوە ٥ هـەروا وشـەی (القفــر) نـاوە بـۆ جوانـەگا كـە لـەدایكی دابـبڕدرێو فێری جوت پێـكردنی بكەن.

**القَفْرَةُ:** بەمانا (القَفر) دێ ٥ واتە: زەوی چۆڵو سوتەمەڕو.

**المِقْفارُ:** چۆڵەوانیو سارای سوتەمەڕۆ.

**قَفَزَ الظَّبـيُ:** ئاسكەكە بازی دا.

**قَفَزَ فلان:** فلاَنكەس مرد.

**قَفِزَ الفرسُ قَفَزاً:** ئەسپەكە هەردوو دەستی تـا ئـەژنۆی سپی بـوو بـەلاَم پاشـوی وانەبوو ٥ (فهو أقفز).

**تقافَزُوا:** بازیان دا.

**تَقَفَّزَتِ المرأةُ بالحناء:** ئافرەتەكە بەخەنە دەستو قاچی خۆی ڕەنگ كردن.

**القافِزَةُ:** ئەسپی تیژڕۆ ٥ بۆق.

**القُفَـــازُ:** دەســـتكێش ٥ بەهـــەردوو دەستكێشەكان دەگوترێ: (قُفَازان).

**القُفَّيْـزى:** یارییـەكی منداڵانـە، بریتیـه لـەوە دارێـك دەچـەقێندرێو بـازی بەسەردا دەدەن.

**القفیــز:** پێومرێــكی دانەوێڵـە پێوانـە وەكـوو قـسناغ لـە وڵاتێـكەوە بـۆ وڵاتێـكی تـر ئەندازەكـەی دەگـۆڕێ، لـە وڵاتـی میـصر قـەفیز، نزیكـەی شانزە كیلۆگرامە.

**القَفیــزُ مــن الأرض:** لـەبواری پێوانـەی زەوی دا سەدو چلوچوار زیراعـە ٥ ئاسنۆكێـكە زمانۆكەی قفڵ دەچێتە ناویەوە.

**قَفَسَ الرَّجُلُ:** پیاوەكە مرد.

**قَفَسَ الشیْئَ:** شتەكەی بەزۆر ستاند.

**قَفَسَ فلاناً:** قژی فلاَنكەسی گرتنو بەرەو خوار ڕایتەكاندن.

**قَفَسَ الظَّبْيَ:** دەستی ئاسكەكەی بەستن.

**قَفِسَ قَنساً:** لایەكی نەرمەی لوتی گـەورە بوو ٥ (فهو أقفَس وهي قفساء).

**تقافَسَ الرجلان:** دوو پیاوەكە عەمبازی یـــەكتری بـــوونو كـــاكۆڵو قـــژی یەكتریان گرت.

**الأقفَسُ:** هەرشتێك درێـژ بووبێتـەوەو چـــەمابێتەوە ٥ كەسێـــك دایكـــی عەرەب بێو بـاوكی ئاعـەرەب بێ ٥ دەشكوتـرێ: (عبد أقفس) كۆیلەیەكی بەدرەوشتو سەرپێچیكەرە ٥ ئەگەر مێینە بوو دەڵێی: (أمة قفساء).

قفش الرجل قفشا: پیاوەكە لە خواردن دا
کارا بوو، زۆر خۆر بوو.
قَفَشَ الشَيْئَ: شتەكەی هەڵگرت.
قَفَشَ فلاناً بالعصا أو بالسيف: بەعەصا
یان بەشمشێر لە فلانكەسی دا.
قَفَشَ الناقةَ: زوو حوشترەكەی دۆشی.
إقْتَفَشَ العنكبوتُ ونحوهُ: جاڵجاڵۆكەكە
چووە كونەكەی خۆیەوەو دەستو
قاچی خۆی وێك نانو خۆی خڕ
كردەوە.
إنْتَفَشَ العنكبوتُ: بەمانا (إقْتَفَشَ) دێ.
القَنْشُ: جۆرێكە لە زۆر خۆریو خێرا
خۆری.
القَفَشُ: دزو جەردەی فێڵبازو بێ
ویژدان.
قَفَصَ قَنْصاً: چوستو چالاك بوو بازی دا
ە سەركەوتو بەرز بۆوە.
قَفَصَ الأشياءَ: شتەكانی لێك نزیك
كردنەوەو كۆی كردنەوە.
قَفَصَ الظَبْيَ: قاچی ئاسكەكەی
كۆكردنەوەو بەستی.
قَفَصَ اليعسوبَ: شاژنە هەنگەكەی لە
هەنگەلانەكەدا بەداوە دەزو حەبس
كرد بۆئەوەی نەڕواتە دەر.
قَفَصَ المرضُ أو البردُ فلاناً: نەخۆشییەكە
یان سەرماكە ئازاری فلانكەسی دا.
قَفِصَ الفَرَسُ قَنَصاً: ئەسپەكە لە بازدان دا
خۆی گرتەوەو بەتەواوی خۆی
هەڵنەدا.
قَفِصَ فلان: فلانكەس قورگی چوزایەوەو
گەدەی ترشا.
قَفِصَ أصابعُ فلان من البرد: پەنجەی
فلانكەس لەسەرمان چونو گرموڵە
بوون.
تَقَّصَ الظَبْيَ: بەمانا (قَفِصَه) دێ.
تَقَّصَ الثوبَ: قوماشەكەی خەتخەت
كرد.
تقافَصَ الثوبُ: قوماشەكە گوڵەكانی
تێك چرژانو چوونە ناو یەكەوە.
تَقَفَّصَ: كۆبۆوە، چۆوە ناو یەك ە
وێكهاتەوە.
القافِصَةُ: لوتكەی بەرز، هەرشتێك
لەزەوی بەرز بێتەوەو بەحەوادا
بچێ.
القُفَاصُ: نەخۆشییەكە توشی وڵاخو
مەڕو بزن دەبێ قاچیان وشك دەبن.
القفاصة: قەفەزچنی، كەسێك پیشەی
قەفەز چنین بێ.
القَفَصُ: قەفەزی باڵندە تێدا بەند
كردن ە لە شوڕكە داری باریك
بەشاشی دەچندرێ.
القَفّاصُ: قەفەز دروستكەر.
القَفِيصُ و القفيصَة: گاسن؛ ئاسنێكە بۆ
زەوی كێلان بەجوتو گاو هێستر
بەكاردێ.

قَفَطَهُ: چاكەی دايەوە، پاداشی چاكەی دايەوە.

القُفْطانُ: پاڵتۆ، ساقو، پۆشاكێكی پان‌و ئاو دامانە لای پێشەوەی لەسەرەوەڕا بۆ خوارەوەی كراوەیە بەجۆرە پشتێنێك هەردوو لای لێك دەدرێن، لەسەر هەموو پۆشاكەكانەوە لەبەر دەكرێ.

قَفَعَهُ بالمِقْفَعَة قَفْعاً: بەدار لە پەنجەكانی دا بۆ تەمبێ كردن.

قَفَعَ فلاناً عن كذا: فلانكەسی لەو شتە مەنع كرد.

قَفِعَ فلاناً قَفَعاً: فلانكەس هەمیشە سەر شۆڕ بوو.

قَفِعَت الأذنُ: گوێچكەی خڕبوونەوەو دەوران دەوریان وێكهاتەوە.

قَفِعَتِ الرجلُ: قاچەكە پەنجەكانی بەرەو دواوە هەڵگەڕانەوە.

قَفِعَ الكبشُ أو الشاةُ: بەرانەكە یان مەڕەكە دووگی كورت بوو ٥ (فهو أقفع وهي قفعاء).

تَقَّعَ البَرْدُ أو الداءُ أصابِعَهُ: سەرما یان نەخۆشی پەنجەكانی گرمۆڵە كردن‌و چواندونی.

تَقَّعَ الشَيْءَ: شتەكەی خستە ناو سەوی دەم تەسكی بن بلاو.

إِنْقَفَعَ النباتُ: ڕوەكەكە وشك‌و ڕەق بوو.

إِنْقَفَعَ عن الشَيْءِ: خۆی لە شتەكە گرتەوە

تَقَفَّعَ فلان: فلانكەس هەمیشە سەر شۆڕ بوو ٥ وێكهاتەوە.

القُفَاعُ: نەخۆشییەكە دەست‌و پێ گرمۆڵە دەكا.

القَفْعُ: مەتاڵێكە لەدار دروست دەكرێ وەكوو دەبابە وابووە جەنگاوەرەكان چوونە ناویەوە لە ژێریەوە چوونە پێش بەرەو قەڵاو شورە بۆئەوەی كونی بكەن‌و بچنە ناوییەوە.

القَفْعَاءُ: ڕوەكێكە ئەڵقە ئەڵقە دەوەستێ.

القَفْعَةُ: (قفة واسعة الأسفل ضيقة الأعلى) سەویەكە بنكی پان‌و پۆڕو دەمەكەی تەسكە.

المِقْفَعَةُ: دارێكە دەسكی هەیە پێی لە پەنجە دەدرێ.

قَفَّ الشَيْءُ قَفّاً: شتەكە وێكهاتەوە.

قَفَّ الثوبُ: قوماشەكە دوای شتنی وشك بۆوە.

قَفَّ الشَعرُ: لەترسان مووەكانی گرژ بوون.

قَفَّ الصيرفي: كابرای پارە گۆڕەوە لەناو پەنجەكانی دا دیرهەمی دزین.

قَفَّت الأرضُ: زەوییەكە ڕوەكەكانی وشك بوونەوە.

**قَـفَّ فـلانٌ:** فلانكەس كەوتە لـەرزەو شەقەتۆڵەو گرژبوو.

**أقَفَّتِ العينُ:** چاوەكە فرمێسكی ڕژانـدو ڕشێنەكەی بەرز بوونەوە.

**قَفَّت السائمة:** حەیوانـە بەرەڵاكراوەكـە بـۆ لـەوەڕان لەوەڕەكـەی بـە وشـكی دەست كەوت.

**قَفَّـت الدجاجَـةُ:** مریـشكەكە لەهێلكـە چووەوە.

**القَفُّ:** پشتی شت.

**القُفُّ:** كورت ◊ تەپۆڵـكەو گـردی ڕەقو پتەو ◊ هەوری ڕەشی گەورە ◊ كونی پـاچ ئـەوەی كلكەكـەی تێـدەخرێ ◊ پیاوی خوێڕیو هەتیومچە.

**القَفّـاف:** پارەگۆڕەوەیـەك زۆر بتـوانی دیرهەم لەنێوان پەنجەكانی دابدزێ ◊ زەمبیـل دروسـتكەرو بەچـنە دروستكەر، بەچنە چن.

**القَفّـاتُ:** جەماعـەتو كۆمـەڵ (قَفّـان الشَّيْ) بەدواداچوونو هەوڵدان بـۆ زانینـی شـت ◊ كـاتو وەرزی شـت ◊ دەشكوترێ: (أتيتهُ على قفّـان ذلـك) بەشوێن ئەوەدا هاتم بۆلای.

**القَفَّةُ:** پیاوی جەستە بچوك ◊ لەرزینی جەستە بەهۆی لەرزو تاوە.

**القُفَّـةُ:** پـاڵتۆی گـەورە ◊ زەنبیـل ◊ بەلـەمی بـچكۆلە كەلـەناو ڕوبـارو دەریاچـەی بـچوك دا بـەكار دەهێندرێ.

**القِفَّـةُ:** لـەرزینو چـۆقە چۆقێـكە لەناكامی لەرزوتاوە توشی جەستە دەبێ ◊ ئـەو پیـساییەی یەكـەمجار لەگەدەی منداڵ دێتە دەر.

**القَفِيـفُ:** ڕوەكـی وشـكەوەبوو قانگەلاشك.

**قَفْقَـفَ:** بـەهۆی سـەرمای زۆرەوە جەسـتەی وەچۆقەچـۆق كـەوت ◊ ددانی وەشەقشەقە كەوتن.

**قَفْقَفَ النبتُ:** ڕوەكەكە وشك بوو.

**تَقَفْقَفَ:** بەمانا (قَفْقَفَ) دێ.

**القَفْقـافُ:** ڕوەكـی وشـكەوە بـوو، قانگەلاشك

**القَفْقَـفُ:** شـەویلە ◊ (قَفْقَفـان) هـەردوو شەویلە.

**قَفْقَفا الطائر:** هەردوو باڵی باڵندە.

**قَفَلَ الفرسُ قفولاً:** ئەسپەكە لاواز بوو.

**قَفَـلَ الجلـدُ أو الـشجرَ:** پێـستەكە یـان درەختەكە وشك بوو.

**قَفَلَ من السفر:** لەسەفەر گەڕایەوە.

**قَفَلَ في الجبل:** بەكێوەكەدا هەڵگەڕا.

**قَفَلَ الطعامَ قَفْلاً:** خواردنەكەی كۆكردەوە.

**قَفَلَ الشيئَ:** شتەكەی مەزەندە كرد.

**قَفَلَ القومَ بعينه:** چاوی بەدوا خەڵكەكەدا گێڕا.

**أَقْفَلَ الجيشُ:** سوپاكه گەڕايەوه.

**أَقْفَلَ البابَ:** دەرگاكەی داخست.

**أَقْفَلَ القومَ من مَبْعَثِهِم:** خەڵكەكەی گێڕايەوه.

**أَقْفَلَ على كذا:** كۆی كردنەوه.

**أَقْفَلَ في الطريق:** له ڕێگادا چاوی بەدوودا گێڕان.

**أَقْفَلَ الشَّيْئَ:** شتەكەی وشك كردەوه.

**أَقْفَلَ العَطَشُ أو الصوم فلاناً:** تينوايەتی يان ڕۆژو فلانكەسی لاواز و وشك كردەوه.

**أَقْفَلَ المال:** ماڵەكەی بەكۆ و بەيەكجار دايه.

**تَقَفَّلَ في الجبل:** بەكێوەكەدا سەركەوت.

**إستَقْفَلَت يدا فلان:** فلانكەس چروك‌و ڕژد بوو.

**القافِلَةُ:** كاروانی بەرێكەوتوو بۆ سەفەر يان لەسەفەر گەڕاوه ٥ (بەمەرجێ كاروانەكە قەرەبالغ بێ‌و ولاخ‌و كەل‌وپەلی زۆريان پێ‌بێ).

**القَفَّالُ:** قفڵ دروستكەر يان قفڵ فرۆش.

**القَفْلُ:** درەختی وشك.

**القُفْلُ:** قفڵ: كه دەرگای ماڵ‌و سندوق‌و شتی وای پێ دادەخرێ‌و بەسويچ‌و كليل دەكرێتەوه ٥ (ك: أقفال وقفول).

**القَفْلَةُ:** پێدانی شتی زۆر بەكۆ و بەيەكجار.

**القُفَلَةُ:** كەسێك هەرچی ببيسێ لەبەری بكاو لەزەينی خۆيدا هەڵی بگرێ ٥ كەسێك گومانی بۆ شتێك بچێ‌و گومانەكەشی ڕاست دەرچێ.

**القَفِيلُ:** درەختی وشكەوەبوو، پێستی وشكەوەبوو ٥ قامچی ٥ شيو و دۆڵی تەنگ كەنەتوانی بەناويدا باز بدەی.

**القيفالُ:** ڕەگێكه له قۆڵدا لەديوی دەرەوه.

**المُتَقَفِّلُ:** (رجل مُتَقَفِّلٌ) پياوێكی ڕژدو دەست قوچاوه.

**قَفَنَ الرجل:** پياوەكه مرد.

**قَفَنَ الكلبُ:** سەگەكه دەمی تێ خست.

**قَفَنَ الشَّيْئَ قَفْناً:** بەقەمچی يان عەصا لێی دا.

**قَفَنَ الشَّاةَ ونحوها:** له پشتەملەوه مەڕەكەی سەربڕی.

**قَفَنَ رأسَهُ:** بۆ زێدەڕۆيی لەمانای (قَفَنَ) دێ.

**القَفِينَةُ:** مەڕ يان حوشتر: كه له پشتەملەوه سەر ببڕدرێ.

**قفاهُ قَفْواً:** له پشتەملی دا.

**قفى الشَّاةَ ونحوها:** مەڕەكەی له پشتەملەوه سەربڕی.

**قَفَى الشَّيْءَ أو الأثَرَ:** شوێن شتەکە کەوت، بەدو شوێنەوارەکە دا گەڕا.

**قفا الله أثَرَهُ:** خودا شوێنەواری فەوتاندو ناسەواری بڕیەوە.

**قفا فلاناً بأمر:** فلانکەسی تایبەت کرد بەکارێکەوە.

**قفا فلاناً:** کارێکی ناشیرینی پاڵ فلانکەس دا.

**قفا السيلُ العُشْبَ:** لافاوەکە گڵو خشتو خاڵی خستە سەر گیاو گژەکە وای لێ کرد بە کەڵکی خواردنی ئاژەڵ نەیە.

**قفي قَفْياً:** بەمانا (قفا) دێ.

**أقفى الرجلُ:** پیاوەکە خۆراکی ناوازەو هەڵبژاردەی خوارد.

**أقفى به:** ڕێزی لێ گرت.

**أقفى فلاناً بأمر:** فلانکەسی هەڵبژارد بۆ کارێك.

**أقفى فلاناً على غيره:** فلانکەسی پاساو دایەوە بەسەر کەسانی دیکەدا.

**قَفَّى على الشَّيْءِ:** شتەکەی داپۆشی، فەوتاندی لای برد.

**قَفَّى الشِّعْرَ:** سەرواى بۆ شیعرەکە ڕێکخست.

**قَفَّى فلاناً:** فلانکەسی شوێن فلانکەسی خست.

**قَفَّى على أثره بفلان:** بەشوێن ئەودا فلانکەسی هێنا ٥ قورئان دەفەرموێ: ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ﴾.

**أقتفاه:** شوێنی کەوت.

**إقْتَفَى الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵبژارد.

**إقْتَفَى فلاناً بأمر:** فلانکەسی بۆ کارێك هەڵبژارد ٥ دەگوترێ:

**إقْتَفَى بفلان:** خۆی تایبەت کرد بەفلانەوە.

**تقافى الناقةَ:** سواری پشتی حوشترەکە بوو.

**تقافى الأكمةَ:** چووە سەر گردەکە.

**تقافى فلاناً:** بوختانی بۆ فلانکەس کرد.

**تَقَفَّى به:** پێشوازی لێ کردو پێی خۆشحاڵ بوو.

**تَقَفَّى الدَّابَّةَ بالعصا:** بەگۆچان لە پشتەملی وڵاخەکەی دا.

**تَقَفَّى فلاناً:** شوێن فلانکەس کەوت.

**تَقَفَّى الشَّيْءَ:** شتەکەی هەڵبژارد.

**إستقفاه:** بەشوێنی دا ڕۆیی بۆ ئەوەی شوێن پێی بسڕێتەوە.

**القافِيَةُ:** پشتە مل ٥ کۆتایی هەرشتێك ٥ لەبواری شیعردا بەو پیتانە دەگوترێ: کە بە بزوێن دەست پێ دەکاو بەشوێنیدا پیتی بێ بزوێن دێن لەکۆتایی دێڕە شیعرەکە.

**القَفَا:** پشتەمل ٥ (وقفا کل شيء) دواوەیەتی.

**القَفَاوَةُ**: ئەو خواردن‌و خواردنەوانەن کە بۆ ڕێزلێنان لە میوان پێشکەش دەکرێ.

**القَفْوُ**: گڕ و تەپ‌و تۆزێکە لەسەرەتای باران بارین دا هەڵدەستێ ٥ گەنین‌و خراپبوونی گژوگیا بەهۆی ئەوەی ژێر لافاو کەوتون.

**القِفْـوَةُ**: هەرشتێـک هەڵبـژێری ٥ هەڵبـژاردە ٥ هەرشتێـك بکرێتـە هۆکار بۆ ڕێزلێنان لە میوان.

**القُفْيَـةُ**: چاڵێـکە: ڕاوکـەر خـۆی تێـدا حەشـار دەدا بۆئـەوەی فرسـەت لـە نێچیر بێنێ.

**القَفِيَةُ**: زێدەو پاساو دانـەوە ٥ دەڤـەرو ناحیـە ٥ مـەڕ: کـە لـە پشتەملەوە سەربڕابێ ٥ هەروا ناوە بۆ کەسێـك شوێن داب‌ونەریتی باوك‌و باپیرانی خۆی کەوتبێ ٥ دەگوترێ: (هو قَفِيـة آبائه).

**قَلَبَ الشَّيْءَ قَلْباً**: شتەکەی هەڵەوگێر کـرد ٥ لای سـەروی هێنایـە خـوارو لای خوارەوەی بـردە سـەروی، یـان چـەپی کـردە ڕاسـت‌و ڕاسـتی کـردە چـەپ ٥ دەشگوترێ: (قَلَبَ الأمر ظهْراً لبطن).

**قَلَبَ فلاناً عما يريـد**: فلانکەسـی لادا لـەو شتەی مەبەستی بوو.

**قَلَـبَ الله فلانـاً اليـه**: خـودا فلانکەسـی مراند.

**قَلَـبَ للقـومِ قَلِيبـاً**: چاڵی بـۆ خەڵـکەکە هەڵکەند.

**قَلَبَ الداءُ فلاناً**: نەخۆشییەکە توشی دڵی فلانکەس بوو ٥ لەدڵی دا.

**قَلِـبَ قَلَبـاً**: لێـوی هەڵـگەڕاوەبوو ٥ دەگوترێ: (قَلِبتِ الشَّفَة) (فهـو أقلـب وهي قلباء).

**قُلِبَ فلان**: فلانکەس دڵی ئازاری پێـگەیی ٥ (فهو مقلوب).

**قُلِبَتِ الدَّابَّةُ**: وڵاخەکە دەردە دڵی توش بوو تۆپی.

**أَقْلَبَ الخُبـزُ**: نانەکە کاتی ئـەوەی هات هەڵەو گێڕ بکرێ.

**أَقْلَـبَ القـومُ**: خەڵـکەکە وڵاخـەکانیان تووشی دەردە دڵ هاتن.

**أَقْلَبَ العِنَبُ**: ترێیەکە ناوەکـەی وشـك بوو بووبە مێوژ.

**أَقْلَـبَ الخُبـزَ**: نانەکـەی هەڵـگێڕایەوە بۆئەوەی دیوی ناوەوەشی ببرژێ.

**قَلَّـبَ الـشَّيْءَ**: بـۆ موبالەغـە لـەمانای (قَلَبَ) دێ ٥ دەگوترێ:

**قَلَّبَ الأُمُورَ**: لەئاکام‌و دواڕۆژی کارەکان ورد بۆوە.

**إِنقَلَـبَ**: بـۆ موتاوەعـەی (قَلَبَـهُ) دێ ٥ گەڕایـەوە بـۆ دواوە ڕۆیـی پـشتی هەڵکرد.

